

# ئازیزی من، خودایە

«وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ»

چۆن هەست بە دڵتەنگی دەکەیت،
کاتێک خودا هەمیشە لەگەڵتدایە؟!

ئامادەکردن و وەرگێڕانی: ماحی



ئازیزی من خودایە



ناوەندی ئاسمان بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان : هەولێر - پشت پارێزگا - بازاڕی کتێبفرۆشان
مۆبایل : ٠٧٥٠٤٢٤٢١٠١
بەڕێوەبەری گشتی ناوەند: بوێر حەسەن
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: مامۆستا سەلمان باقی

---

ناوی کتێب: ئازیزی من، خودایە
ئامادەکردن و وەرگێڕانی : ماحی (بوێر حەسەن)
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
دیزاینی بەرگ : ئیبراهیم صاڵح نەسیم
بابەت : ئایینی، پەروەردەیی
ساڵی چاپ : دووەم ٢٠٢٣
چاپخانە : جەنگەڵ
تیراژ : (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ١١٤٨ )ی ساڵی ( ٢٠٢٢ )ی پێ دراوە.

# ئازیزی من خودایە

وهو معكم أين ما كنتم

ئامادەکردن و وەرگێڕانی:

ماحی (بوێر حەسەن)



# وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ

الحيديد: ٤

واتە: لەهەر شوێنێكدا بن،

ئەو زاتە ( الله ) لەگەڵتاندایە و پێتان دەزانێت

لە ئەبی هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت)،

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت: (هەر كەس صەڵەواتم لە دیدار بدات، خـــودا ڕۆحـــەكەم بۆ دەگێڕێتەوە، تـا وەڵامی صەڵەواتەكەی بدەمەوە). (رواه أبو داود). رقم الحديث (٢٠٤١).



﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ۚ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ (الأحزاب ٥٦)

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (التوبة ١٢٨)

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبياء ١٠٧)

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ (القلم ٤)

## پێشەکی

**بەناوی خودای گەورە و میهرەبان**

دروودی بێ پایانی خودا بڕژێ بەسەر سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ)، کە یەکپارچە نوور و ڕەحمەت بوو بۆ تەواوی جیهانیان. ئەگەر پەیام و پەیامکاری بریتی بێت لەو بیر و بەرنامە و دیدگایەی کە مرۆڤ باوەڕی پێی هەیە و کەم و زۆر هەوڵیداوە لە خۆیدا ڕەنگیان پێ بداتەوە و دواتر بە گوفتار و ڕەفتاریا بیانناسێنێتەوە بە خەڵکانی تر، ئەوا پەیامی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەربێت) جوانترین و تەواوترین و سەلامەتترین و ڕۆشنترین و ئارامیبەخشترین و ڕێکوپێکترین بەرنامە و پەیام بووینە لە تەواوی مێژووی مرۆڤایەتی و هەمیشە زۆرترین سوود و قازانجی ماددی و مەعنەوی و دونیایی و دواڕۆژییان بە مرۆڤەکان بەخشیوە. هۆکارەکەشی ئەوە بووە کە خودی پەیامەکە هی خودا و خالقی مرۆڤەکان بووە و بەڕاستیش هەر ئەو لەهەر دروستکراوێکی تر باشتر دەزانێت چی باش و گونجاوە بۆ مرۆڤەکان. پەیامی هەموو پەیامبەرانیش پڕە لە (مبادئ-بنەما) و دەستوور و یاسای ڕێکوپێکی وەها کە لەگەڵ سروشت و فیترەتی مرۆڤدا هەماهەنگە و چەشنی بەرنامەیەکی تێر و تەواو، ڕێکوپێکی بە ژیان دەبەخشن و بەهۆیانەوە مرۆڤەکان دەتوانن سەرجەمی پەیوەندییەکانیان ڕێک بخەن و بێ کێشە و بێوەی و سەلامەت و بەوپەڕی دڵارامییەوە ژیان بکەن لە دونیادا. دەبێ

ئینسان بیری ئەوەش بکاتەوە کە خوا هیچ شتێک بەبێ حیکمەت ئەنجام نادات، کارێکی بێ هوودە ناکات، هەر شتێک دەیکات لەبەر حیکمەتێکە و فائیدەیەکی تیایە، بە تایبەت لەگەڵ ئینسان، هەر کارێک بۆ ئینسانی دەکات، هەر شتێک لە ئینسان داوای دەکات کە بیکات، یا هەرشتێک بۆی ئەنجام دەدا، بەدڵناییەوە یا بۆ ئەوەیە سوودێک بە ئینسان بگەیەنێت، یا زیان و زەرەرێکی لێ دوورخاتەوە. قەدەری بەخێری ئێمە هەماهەنگە لەگەڵ سەرداری پێغەمبەران (ﷺ)، و تەواوترین پەیام و بەرنامەی خودا کە (قورئان)ە، قورئان پڕاوپڕە لە یاسا و ڕێسای تۆکمە و ژیانبەخش و ڕێکخەر بۆ دونیا و دوارۆژی مرۆڤەکان و، خۆشەویستیش (ﷺ) جوانترین و هەستیارترین نموونە و پێشەنگی ئەو پەیام و بەرنامەیە بوو لە جێبەجێکردنا، بە چەشنێک تەواوی هەست و نەست و دڵ و گیان و هەڵوێست و هەڵسوکەوت و گوفتار و ڕەفتاری ڕۆشنکەرەوەی پەیام و بەرنامەکەی خودا بوو، پێغەمبەرێکی(ﷺ) مەزنی وەها کە هەم ڕابەری گۆڕانکاری بوو لەخۆی و هەمیش ڕێنیشاندەری گۆڕانکاری بەبەخێری دەروونی و ژیانیش بوو بۆ تەواوی مرۆڤایەتی. مرۆڤەکان دابەش دەبنە سەر سێ چەشنە کەسایەتی بنەڕەتییەوە و هەریەکشیان خاوەن خەسڵەت و ئاکاری تایبەتمەند بەخۆیانن، ئەوانیش بریتین لە (کەسایەتی پەیامدار و مەبدەئی، کەسایەتی تێکەڵ لە پەیام و میزاج، کەسایەتی میزاجی).




## یەکەم: کەسایەتی پەیامدار و مەبدەئی:

ئەو کەسایەتییەیە کە تەواوی پەیامەکانی خودا و خۆشەویستی (ﷺ) کردۆتە بەرنامەی ژیانی و بەپێی یاسا و ڕێساکانی ئایین لەگەڵ تەواوی بوونەوەران بەگشتی و مرۆڤ بە تایبەتی مامەڵە و هەڵسوکەوت دەکات، کاتێک ڕووبەڕووی هەرشت و ڕووداوێکی خۆش یان ناخۆشی ژیان دەبێتەوە، بەپێی پەیام و ڕێنمایییە ئایینیەکان هەڵوێست دەنوێنێت... واتە مرۆڤێکی سەربەست و ئازادی وەهایە کە هیچ کام لە هێزی ناخەکی (نەفس و شەیتان) و هێزی دەرەکی (مرۆڤەکان - ستەمکاران) بەگشتی نە بەخەڵات و نە بەخشیش و نە بەترساندن ناتوانن تەنانەت لە یەک دانە پەیام و مەبدەء لای بدەن و لەسەر ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆی بیترازێنن.

## دووەم: کەسایەتی تێکەڵ لە پەیام و میزاج:

بریتییە لەو کەسایەتییەی کەلە هۆش و دڵ و دەروونیا باوەڕی بە جوانی و حەقیقەتی پەیام و یاسا و ڕێسا ئیلاهییەکان هەیە و زۆریش بەلایەوە جوانن، بەڵام بەپێی پێویست ئیشی لەسەر دڵ و دەروونی خۆی نەکردووە و نەیتوانیوە تەواوی بنەما و فەرمانەکان لە دڵیدا جێنشین بکات و سەرجەمیان ڕەنگ پێبداتەوە لە واقیع و ژیانی خۆیدا، بۆیە لە کەوتنە نێو ڕووداوەکان و ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان هەرجارەی بەجۆرێک و لەهەرکات

و شوێنێک بە چەشنێک مامەڵە و هەڵسوکەوت دەکات، هەندێک جار پەیامدارانە و بەپێی فەرمان و یاسا و ڕێساکانی ئایین و هەندێ جاریش بەپێی میزاج و بەرژەوەندییەکانی خۆی مامەڵە و هەڵسوکەوت دەکات.

## سێیەم: کەسایەتی میزاجی:

بریتییە لەو کەسایەتییەی کە خاوەنی هیچ یەکێک لە بنەما و پەیام و یاسا و ڕێسا ئایینیەکان نییە و ئەگەر بەهۆش و بیریش باوەڕی پێیان هەبێت و جوان و ڕێکوپێک بن بەلایەوە، بەڵام هەرگیز لەدڵ و دەروون و کردار و ڕەوشتیا جێگیری نەکردوون و هەرگیز بەپێی ڕێنماییە ئیلاهییەکان مامەڵە و هەڵسوکەوت ناکات و بەپێی بەرنامەیەکی تۆکمە و شایستە کە بۆ مرۆڤ داندراواە ڕووبەڕووی ڕووداوە خۆش یان ناخۆشەکانی ژیانی نابێتەوە، واتە کەسێکی میزاجی بەرژەوەندیخوازی خۆویستی وەهایە هەموو دونیای تەنها بۆخۆی دەوێت و هەمیشە بەپێی بەرژەوەنییەکانی مامەڵە و هەڵسوکەوت دەکات، کەسایەتییەکی ناجێگیری نادڵارامی وەها کە لەسەر هیچ بناغەیەکی ئینسانی نەوەستاوە و خۆشی سەری لەخۆی دەرناچێت و خەڵکانیش دەستەوەستانن لە هاودەمیکردنی، چونکە شتێک نییە پێی بناسرێتەوە و بیر و باوەڕ و بەرنامەیەکی ڕۆشنی نییە و کۆنترۆڵی ژیان و هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانی پێ بکات...

بەپێی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ هەتا لە ئیمان و پەیام و بنەماکانی نزیک بێتەوە و کاریان پێبکات ئەوەندە لە میزاجییەت دووردەکەوێتەوە و ڕزگاری دەبێت، هەتا لە میزاجییەت و بەرژەوەندخوازی و خۆویستیش نزیک بێتەوە ئەوەندە لە ئیمان و پەیامداری دووردەکەوێتەوە و خۆی و خانەوادەی و خەڵکانی کۆمەڵگاش تووشی سەرگەردانی دەکات.





## ئەم کتێبە پێشکەشە بە

کچی ئازیزمان، خاتوو ( سـارا سـەردار ).

پێشەنگ و سەرمەشقی کچانی موسوڵمان.









١

ئەو شتەی تۆ پێت ناخۆشە

بەتایبەت خـێرێکی زۆر زۆری تۆی تێدایە،

ئیتر خــەمی چیتە؟

(وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيئاً وَ هُوَ خَيْرٌ لَكُم وَ عَسى أَنْ تُحِبُّوا شيئاً وهُوَ شَرٌّ لَكُم)



٢

خودا بەچی لێت خۆش دەبێت؟

سەلام لە خەڵکی بکە و وەڵامی سەلامیان بدەوە و گوفتارت باش بێت لەگەڵیان.



ئەمە قورس بوو؟

حەز دەکەی خودا لەهەموو گوناهەکانت خۆش بێت؟

کەواتە ئاگات لەم دوو خاڵە بێت.



٣

عاقڵترین کەس ئەو کەسەیە ئەم سێ سیفەتەی تێدابێت:

- کارە چاکەکانی ئەوەی پێویستن لەسەری، بەزووترین کات ئەنجامی دەدات، دوای ناخات.

- مردن زۆر بەنزیک دەزانێت.

- زۆر ئامادەباشە بۆ دیداری پەروەردگاری و گیان دەرچوون و بەجێهێشتنی دنیا.

٤

دەتەوێ ئاسوودە بژیت؟

دوو شتە:

یەکەم یەقینت هەبێت، بەڵێنەکانی خودا و پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستن.

دووەم، ڕازی بە بە ڕسق و بەشی خوای گەورە.

٥

خودای گەورە ئەگەر کەسێکی خۆشبووێت، پێش مردنی تەوبەیەکی ڕاستەقینەی بە قسمەت دەکات.

خۆی چاک دەکات، خۆی پاک دەکات، خۆی ڕاست دەکات، ئیتر بە وێنەیەک هەموو دەوروبەری، چ دراوسێ، چ خزم و کەس و کار، هەموویان خۆشیان دەوێ و لێی ڕازین.

لە لووتکەی ڕازیبووندا وەفات دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا.



٦



ئەو کەسەی دەچێت پارووە نانێکی حەڵاڵ بۆ دایک و باوکێکی بەتەمەندا چووی پەیابکات، بۆ ئەوەی بۆخۆی پەیای بکات، بۆ خێزان و منداڵە بچووکەکانی، ئەوا تا ئەو ساتەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە، ئەوا لە عیبادەت دایە وەک جیهاد لە ڕێگەی خودا بۆی ئەژمار دەکرێت.





## ٧

دونیا چییە؟

(وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ)

کاڵایەکی هەڵخەڵەتێنەرە،

(وما هذهِ الحياةُ الدنيا إلا لهوٌ ولَعِبٌ)

بەخوا گاڵتە و گەپە هەموو دونیا...

لەوێ بۆت دەردەکەوێت، کە چوویتە قیامەت.

حەزمان لە چییە؟

لە پارەی زۆر، لە منداڵی زیاد، حەز دەکات سیارەکەی مۆدێلی بەرزتر بێت، خانووەکەی جوانتر بێت، جلەکەی باشتر بێت، باخەکەی گەورەتر بێت!

ئەمە ژیانی دونیاییە!

بەتەمای چیت دەستکەوێت؟

بەخوا دین و ئیمان نەبوایە، ئەم ژیانەی دونیا فلسێکی نەدەهێنا.





## ٨

ئەی ئەوەی دڵتەنگی،

دەتەوێ خەم لەسەر دڵت بڕوات؟

گومانت باش بێت بەخودا...

بەم نزیکانە خەم نامێنێت.

ئەی ئەوەی قەرزداری، تۆزێک پێبکەنە، دڵت خۆشبێت، خودا لەسەرەوەیە، خەزێنەی ئاسمانەکان و زەوی لەلایە.

گومانت باش بێت، إن شاءالله بەم نزیکانە قەرز نامێنێت.

ئەی ئەوەی تووشی بەڵایەک بوویتە،

لە خودا باڵادەستتر هەیە؟

پێبکەنە، دڵخۆش بە، إن شاءالله کۆتایی دێت.



## ٩

خەمێکت بۆ هاتە پێش هەستە، فەرموو:

دەستنوێژ هەڵبگرە و نوێژ بکە.

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کاتێک شتێک دڵتەنگی کردبایە، یاخود هەر خەمێکی بهاتبایە ڕێ، چی دەکرد؟

دەستنوێژی تازە دەکردەوە و دەستی دەکرد بە نوێژ کردن لەگەڵ خوای گەورە،

بۆ ئەوەی خەمی لەدڵدا نەمێنت.

کەواتە (دەستنوێژ و نوێژ) لابەری خەم و دڵتەنگین.



## ١٠

ئایا ئافرەتانی دونیا وەک حۆرییەکان وان؟

نەخێر!

لە حۆرییەکان زۆر جوانترن،

زۆر بەڕێزترن،

زۆر سەنگینترن،

زۆر سەلارترن،

زۆر باشترن،

لە کۆتاییدا، زۆر ڕێزلێگیرواترن!

دەزانم ئێستا دەپرسێت ئاخر لەبەرچی؟

بەهۆی ماندووبوون و زەحمەتی کێشان و خەباتی دوور و درێژی دونیایان و ناڕەحەتی و ناسۆرییەکانی ژیان!

پرسیوتە سکپڕی چەندە ئازاریان هەیە؟

دەزانی منداڵبوون چ ئازارێکی هەیە؟



نابینی منداڵ گەورەکردن و بەخێوکردنی چ زەحمەتییەکە؟

ئەی ئەرکی دونیا؟

لەبەر هەموو ئەمانە و دنیایەک شتی نەگوتراو و نەزانراوی تر، ئەمان بەڕێزترن لە حۆرییەکانی بەهەشت.

## ١١

ئەم تەمەنە کورت و ئەم ژیانە کاتییە دونیا،

ئەم هەموو ڕق و قینەیەی دەوێت؟

ئاخر لەبەرچی و لەسەر چی؟

بەخوا کەسی لێنامێنێت...

هەمووی چۆڵی دەکات، ئەمرۆ بێت یان سبەی، هەمووی بەرەوی قەبر و قیامەت دەڕوات!

## ١٢

قال الرسول (ﷺ):

[لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر.]

ناچێتە بەهەشت!

ئەو کەسەی بە هێندەی مسقاڵە زەڕڕەیەک

(خۆ بەگەورەزانین) لە دڵیدا هەبێت.

دڵ و دەروونی خۆت بپشکینە!

بزانە چی تێدایە؟





بۆ بەدەستهێنانی خەون و ئاواتەکانت،

ڕێگەی ئیماندارانە بگرە بەر و سووربە لەسەر بەدەستهێنانی.

پشت بە خودا ببەستە،

بێ دەستەڵات و دەستەوسان مەبە،

کەس هەیە لە خودا متمانەپێکراوتر؟



ئامان هیچ کاتێک ئەم کارە نەکەیت!

نوێژێکی فەرز بەئەنقەست لەدەست نەدەیت،

چونکە نوێژ پەیوەندییە،

پەیوەندی تۆ لەگەڵ خالیقەکەت.

پەیوەندیت لەگەڵ لەخودای میهرەبان مەپچڕێنە.





# ١٥

خەم و خەفەت مەخۆ!

بە خوا هیچ سوودی نییە خەفەتخواردن!

نە بۆ دینت، نە بۆ دونیات،

ئیلا مەگەر خەم و هەممێک بێت لەبەر

خودای گەورە، ئەوەش پاداشتەکەی هەر لای خۆیەتی.

ئەگینا خەفەتی دونیایی هیچ سوودی نییە.

خودا تۆی دروستکردوە، ئەوەتا گوناه دەکەیت دەتپۆشێت،

بانگت دەکات، دەفەرمووێت بەندەکەم وەرە تۆبە بکە و لێت خۆش دەبم!

خودا، تۆبەی بەندەکانی زۆر پێخۆشە...

ئیتر پێمبڵێ خەمی چیتە؟





# ١٦

دلت خۆش بێت إن شاءالله،

دوودڵ مەبە،

پێنج و دوو ڕۆژێکە دونیا، دەیگوزەرێنیت...

ڕازی بە،

سوپاسی خودا بکە،

ئارامگربە،

دوعا بکە،

ئەوە بزانە،

**پاڕانەوە، تەنها ڕێگەی ئارامیی و دڵنەوایی تۆیە.**





## ١٧

ئازیزی مەدینە (ﷺ) دەفەرموویێت:

**[مَن لا يشكرُ النَّاسَ لا يشكرُ اللهَ]**

واتە: ئەوەی نەیتوانی بێت سوپاسگوزاری خەڵکی بکات لەسەر ئەو چاکانەی کە لەگەڵیان کردووە، ئەوا ناتوانێ سوپاسگوزاریی خــوداش بکات بۆ ئــەو نیعمـــەت و بەخششانەی کە پێی بەخشیوون.



## ١٨

وریـــابە!

مەگەر خودا بۆ خۆی پارچەکانی دڵێکی شکاو پێکەوە بلکێنێت، ئەو دڵانەی زۆر دەبوورن و چاوپۆشی دەکەن، لەسەر ئازارەکانی دەوروبەر زۆر ئارام دەگرن، بۆ تەبایی و مانەوەی خۆشەویستی و دۆستایەتی زۆرجار تەنەزول بە خۆیان دەدەن، ئەو جۆرە دڵانە کاتێ بڕیاری ڕۆیشتن دەدەن هەرگیز ناگەڕێنەوە.





## ١٩

چۆن بزانم دوعاکەم وەرگیراوە؟

پاڕانەوە و لاڵانەوە لە خزمەتی پەروەردگار

نەریت و پیشەی بەردەوامی باوەڕدارانە.

هەرکاتێک بە دڵێکی جۆشسەندو و چاوێکی پڕ فرمێسک دوعاکانت بۆ خزمەتی پەروەردگارت بەرزکردەوە و دوای تەواوبوونی دوعاکە هەستت بە واڵابوونی سینە و خۆشی و سروور کرد، بزانە دوعا و داواکەت لای خودا وەرگیراوە.





٣٠

ژیان فێری کردم

ئازار و ناخۆشی بەشێکە لە ژیان، فێری کردم لەسەر رووالەت زوو بڕیار نەدەم، فێری کردم زیاتر بە رووی ناوەوەی خۆمدا بڕوانم، کەمتر سەرنجی دەرەوە بدەم، گێژاوەکانی ژیان پێیان وتم: خۆت فریادڕەسی خۆتی، لە چاوەڕوانیدا خۆت مەهێڵەوە، کەس نابێتە فریادڕەسی تۆ، ئەزموون فێری کردم دۆستێکی گیانی بە گیانی لە ئاو و نان بۆ مرۆڤ پێویسترە، نەک لە پێناوی کەرەستە مادییەکان، بەڵکو بۆ ئاسوودە کردنی دڵ و رۆح.



٣١

لەم رۆژگارە مرۆڤ گرفتی لەگەڵ خودا نییە، گرفتی لەگەڵ کەسانێکە پێیانوایە لەدوای خودا ئەوان دێن.





## ٢٢

بۆچی لەسەرەتای دوعاکانمان بە ناوی (رَّبّ):

رَبَّنا... ربِّ... یا ربّ... دەستپێدەکەین؟

ئێمە کاتێک داوا بۆ لای خودا(عز وجل) بەرزدەکەینەوە ناوی (رب) دەدەینە پاڵ خۆمان و دەڵێین (ربّنا-پەروەردگاری ئێمە)، یان دەڵێین: (ربِّ-پەروەردگاری من)،

یان: (یا ربّ- ئەی پەروەردگارا)،

ئەمەش نزیکی پەروەردگار لە بەندەکەوە دەگەیەنێت.

زۆربەی هەرە زۆری دوعــا قورئــانییەکان بە نــاوی (ربّ) دەستپێدەکەن.

سەرەتا دەبێت بزانین مانای ناوی (رب) بریتییە لە «خاوەن»، «کارهەڵسوڕێنەر»، «سەرۆکار»، «بەخێوکەر».

نموونەی بەرز و بڵند بۆ خــودایە، کاتێ مــنداڵ لە خــێزاندا پێویستییەکی بۆ پەیدا دەبێت پێویستییەکەی دەبات بۆ لای باوکی یان دایکی، چونکە دەزانێت خاوەن و بەخێوکەر و سەرۆکار و کارهەڵسوڕێنەری ئەو بریتییە لە باوکی یان دایکی.

کاتێ بە ناوی (ربّ) دەپاڕێینەوە زمانی حاڵمان دەڵێت:

ئەی خاوەنی من، ئەی بەخێوکار و سەرۆکاری من، پێویستی و ئاتاجیم هەیە لە خزمەتت، بۆم جێبەجێ بکە.

**(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).**



٢٣

زۆر جوان گوێم بۆ بگرە:

هەموو چاکەکانی دونیات،

وابەستەیە بە دۆسیەی نوێژەوە!

ئاگەداربە...

نوێژ نەکەی، هیچ شتێکت لێ قبوڵناکرێت.



## ٢٤

ئەگەر کەسێک، هەموو خەم و خەفەتەکانی دونیا لەوە کۆبکاتەوە خودا لە خۆی ڕازی بکات و بەهەشت بەدەست بهێنێت؛

بەڵێن بێت،

خودا دڵی دەوڵەمەند دەکات،

کار و باری دونیای لەسەر ئاسان دەکات،

ڕسق و کەسابەتیشی واسع و پڕ خێر و بەرەکەت دەکات.

## ٢٥

دڵتەنگ مەبە، خەم مەخۆ.

خەم لە چی دەخۆیت؟

لە چی دەترسیت؟

مرۆڤ زۆر عەجیبە!

ئایا تۆ لەخۆت تێگەیشتوویت تۆ کێیت؟

بۆ مەگەر هەر تۆ دەمریت؟

ئەی هاوار... بۆ غیرەت و توانا و ئیمانی ئێمە!



٢٦

باش بزانە:

هەموو ئەو شتانەی لە ژیاندا بۆت دێنە پێش،

یەکێک بۆی موقەدەر کردوویت کە زۆر شارەزایە،

زۆر بە ڕەحمە،

کە ئەویش خودای خۆتە.

بە هەموو حیکمەت و ڕەحمەت و عەدالەت و عیلم و زانیاری خۆی ئەوەی بۆ تۆ بە چاک داناوە ئەی مرۆڤ.

کەواتە تۆش پێتخۆش بێت و ڕازی بە.





## ٢٧

لە ژیانتدا هاوڕێیەتی ئەم جۆرە مرۆڤانە مەکە:

یەکەم درۆزن، چونکە لە خشتەت دەبات،

دوورت لێ نزیک و نزیکت لێ دوور دەکاتەوە.

دووەم نەکەیت هاوڕێیەتی کەم عەقڵ بکەیت.

سێیەم ئاممان هاوڕێیەتی ڕەزیل نەکەیت،

پێویستیت بە کەمترین پارە بێت هاوکاریت ناکات.

چوارەم، نەبیتە هاوڕێی گوناهبار و تاوانبار،

بۆ پاروە نانێک دەتفرۆشێت.



## ٢٨

وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)،

فەرمووی بەڵێ؟

- مرۆڤ ئەگەر یەکێکی خۆشویست ئەوە لە قیامەتدا چۆنە؟

خۆشەویستمان(ﷺ) فەرمووی :

[الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ].

واتە: هەر کەسێت خۆشبوێت، خەمت نەبێت، لەگەڵ ئەویت لە قیامەت.





## ٢٩

دیـــــن:

بریتییە لەکۆمەڵێک تەعریفاتی پەیوەست بە خودا و مرۆڤ و بوونەوەر، بەگشتیی.

بریتییە لەکۆمەڵێک ڕێنمایی و یاسا و فەرمان و قەدەغە، کەدوواجار پاداشت بۆ ئەنجامدانیان هەبێت و سزاش بۆ سەرپێچیی کردنیان هەبێت.

دیـــــن:

بریتییە لە ئیعتیقادیاتە جێگیرەکان و ئەخلاقیاتە سابیت و هەمیشەیی و ڕەگداکوتاوەکان.

ئیعتیقادیاتەکان

تایبەتن بەخودا و

ئەخلاقیاتەکانیش

تایبەتن بەمرۆڤ.

نموونەی ئیعتیقادیات، بەم چەشنە:

خودا تاقانەیە،

خالیقی ئەو بوونەوەرەیە،

خۆی بەدیهێناون و هەرخۆیشی چاودێرییان دەکات و بەردەوامیشییان پێدەدات.

ڕۆژێک هەیە بۆ زیندووبوونەوە،

پاداشت هەی بۆ چاکەو چاکەکاران و سزاش هەیە بۆ خراپەو خراپەکاران و هتد.

نموونەی ئەخلاقیاتیش،

هاوچەشنی ئەم مەبادیئانە:



دەست و دڵ هەڵگرتن لەهەموو چەشنە زیانگەیاندنەکان، بەهەموو شێوازەکان، بۆ تەواوی مرۆڤەکان،

کۆتایهێنان بە ستەم و

پێشێل نەکردنی ماف و ئازادییەکانی کۆی مرۆڤەکان و هتد.





## ٣٠

دەبێ بە ئیمان و ئەخلاق و ئاکار و مامەڵەی مرۆڤدۆستانەی ژیانسازانە،

جیاواز بین لەکۆمەڵگا...

نەک بە سیما و ڕووخسار و ڕووکەش و پۆشاک و دروشم و دەستەواژەکان،

واتا:

بە کردار

نەوەک بە گوفتار.





## ٣١

ئارامیی و هێمنیی:

بانگەشە و قسە نییە،

دەبێ لە ژیان و ئاکاری خاوەنەکەی ڕەنگداتەوە،

دەبێ لەکاتی نەخۆشیی و ناخۆشییەکان، هاوسەنگیی ناخی لەدەست نەدات.



## ٣٢

خودای میهرەبان تەنها خۆشەویستی بەندەکانی دەوێت، پێیخۆشە کاتێک ئەوان بڕیاری چوونە بەهەشت دەدەن، بەڵام نیگەرانە کە کەمێک لە بەندەکانی بڕیاری چوونە جەهەندەم دەدەن، کەچی لەبەر ڕێزی زۆری بۆ مرۆڤ ڕێگریی لەو بڕیارەشیان ناکات.





گەورەکردنی هەرشتێک لەناخت،

لەسەر حیسابی بچووککردنەوەی ئەوانی ترە،

بزانە چیی و کێ شایستەی ئەوەیە دڵت

داگیر بکات؟



تۆوی ئیمان کاتێک چەکەرە دەکات و سەوز دەبێت و قەد و باڵای بۆ دروست دەبێت و گوڵ دەکات و بەر دەدات:

زەوی جوتیارەکە- کە بریتییە لە دڵ- پاکژ و پاک و بێگەرد بێت-

**[ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً، إذا صَلَحَتْ، صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ، فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وهي القَلْبُ]** (رواه مسلم)

دەزانن پارچە گۆشتێک لە جەستەدا هەیە، گەر هاتوو ڕاستەڕێ بوو، هەموو جەستە دێتە ڕاستە، گەر تێکچوو هەموو جەستە تێکدەچێت، دەزانن ئەو پارچە گۆشتە بریتییە لە دڵ.

# ٣٥

هەر گوناهێک بەهۆی شەهوەت و ئارەزووی نەفسەوە کرابێت، ئومێدی عەفووی لێ دەکرێ. بەڵام گوناهێک بەهۆی خۆ بەزلزانین و فەخر بەسەر خەڵکدا و تەکەبورەوە بکرێ، رەحمەتە خوای گەورە لەو گوناهە خۆش ببێت. بۆ وێنە و میسال، گوناهی حەزرەتی ئادەم، بەهۆی ئارەزووی نەفسەوە بوو، خوای گەورە عەفووی کرد و لێی خۆشبوو، بەڵام گوناهی شەیتان بە هۆی خۆ بەزلزانین و تەکەبورەوە بوو، لە قاپی ڕەحمەت دەرکرا و تۆقی لەعنەتی لە گەردن کرا.





# ٣٦

خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) فەرزە لەسەر ئومەتەکەی،

بەم ڕێگانە دەگەینە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ):

یەکەم: ناسینی پێغەمبەر (ﷺ): ئەمەش لە چوار ڕێگەوە: قورئان و، ژیاننامەی موبارەکی و، فەرموودە شیرینەکانی و، ناسینی هاوەڵانی چونکە پەروەردەی دەستی ئەو بوون.

دووەم: پابەندبوون بە شەرع و ئایینەکەیەوە، بۆ گەیشتن بە ئەو(ﷺ) گەرەکە بە ڕێگەکەی ئەودا هەنگاو هەڵبگرین.

سێیەم: جێبەجێ کردنی سوننەتەکانی لە ژیانی ڕۆژانەدا.

چوارەم: نزیکبوونەوە لە کەسایەتی مەزنی پێغەمبەر (ﷺ): ئەوەش خۆ ڕازاندنەوەیە بە ڕەوشت و ئاکار و سیفەتی باڵای پێغەمبەر(ﷺ).

پێنجەم: ڕەوانە کردنی صەڵەوات و سەلام بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ).

(إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا).



## ٣٧

مرۆڤ حەز و ئارەزووی تێدایە، لەبیرچوون و بێئاگایی رووی لێ دەکات، شەیتان وەسوەسە و رازانەوەی گوناهی لە لایە، زەمینە بۆ گوناهان دەڕەخسێت، ئەوەی مرۆڤ قوتار دەکات سێ شتە:

یەکەم: کاتێک نێوانی خۆشە لەگەڵ خودا لێی بپاڕێتەوە تا کاتی لاوازی و بێئاگایی حەزەکان زاڵ نەبن بەسەریدا.

دووەم: خۆی لە شوێنی گوناه بەدووربگرێ و زەمینەی بۆ نەسازێنێت.

سێیەم: هەرکات کەوتە ناو زەمینەی گوناهان خودا و سزای خودا بە بیری خۆی بهێنێتەوە-

(إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ) .

ئەوانەی خۆپارێزییان ئەنجامدا کاتێک بە گرتنێکی شەیتانی دەگیرێن خودایان بیر دەکەوێتەوە، بۆیە بەرچاو رۆشن دەبن.

## ٣٨

یەکێک لە ناوە جوانەکانی خودا (النُّور)ە:

(اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)

خودا نووری ئاسمانەکان و زەوییە.

قورئانیش نوورە:

(وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُبِينًا)

نوورێکی ئاشکرا و ڕۆشنکەرەوەمان بۆ ئێوە دابەزاندووە.

پێغەمبەریش نوورە:

(قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ)

لە خوداوە نوورێک(پێغەمبەر) و کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەمان بۆ ئێوە دابەزاندووە).

ئیمانداریش خاوەنی نوورە:

(وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ)

نوورێکی بۆ دابین دەکەین بەناو خەڵکیدا هاتووچۆی پێ بکات).

بە ئیمان و شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)،

و دەستگرتن بە قورئان، و خۆشەویستی خودا خۆت نوورانی بکە و داوای نووری لێ بکە:

**(وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِنْ نُور)**

هەر کەس خودا نووری پێ نەدا نووری نییە.

**٣٩**

بوونی ساتێکی تەنهایی لەگەڵ خودا-چەند خولەکێکیش بێت- مانای زۆرت پێ دەبەخشێت، تیایدا موناجات بکە، دەست بەرز بکەرەوە و لێی بپاڕێوە، پێویستی و ناتەواوییەکانی خۆتی بۆ باس بکە، پێی بڵێ من تۆم خۆشدەوێت،

**(وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ)**

بە حەز و ترسەوە داوایان لێ دەکردین، ئەوان بۆ ئێمە کەسانێکی خاشیع بوون.



## ٤٠

دڵنەواترین فەرموودەی خۆشەویستمان (ﷺ)،

سەیری ئەم فەرمایشتە بکەن،

**[أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي]،**

خودا دەفەرموویت من لەگەڵ ئەو گومانەم کە بەندەم بەمنی دەبات،

تۆ گومانی چی دەبەی بە خودا؟

دەوڵەمەندت بکات؟

بەڵێ دەوڵەمەندت دەکات،

فەقیرت بکات؟

بەڵێ فەقیرت دەکات.

تەندروستیت باش بکات؟

بەڵێ شیفات بۆ دەنێرێت.

تۆ گومانت چییە بەخودا،

خودا دەفەرموویت لەویم.

ئەی فەرمایشتەکە دوای ئەمە چی دەڵێت؟



[وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي]

سبحان اللّٰه! مەعییەتی خودا لەگەڵتدایە تا بڵێی (یـا اللّٰه)،

کەچی ئێمـەی گوناهبار، لەبەر دونیـا و بەهـۆی خۆ سەرقاڵکردنمان بە شتە پڕو پووچەکان، جار هەیە، لە ماوەی (٢٤) سعات، بۆ تەنها جارێک ناوی (اللّٰه) مان بەسەر زاردا نایێت!

بەردەوام ناوی (اللّٰه) بهێنە، بۆ ئەوەی هەست بە مەعییەت و نزیکی ئەو بکەیت لە ژیانتدا.



٤١



ڕۆحی عیبادەت زیکری خودایە،

دڵی مرۆڤ ماسییە، و یادی خودا دەریایە، ماسی بەبێ ئاو ناژی، دڵی خاڵی لە زیکری خودا وێرانەیە:

(أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)

(دەزانن بە یادی خودا دڵان ئارام دەبنەوە)

## ٤٢

تا دەتوانیت لەبەر خودا بەرامبەرەکانت خۆشبوێت،

ڕق لە کێ هەڵدەگریت؟

تەنها ڕقت لە شەیتان بێت،

چونکە تەنها دوژمنی تۆ شەیتانە.

بە بەرامبەرەکانت بڵێ، لەبەر خودا ئێوەم خۆشدەوێت. هیچ کاتێک ڕێگە نادەم دڵم پڕ بێت لە ڕق و قین، ئەو ئازارە ناخەمە دڵی خۆمەوە، بە پێچەوانەوە، هەر خۆشمدەوێن.

## ٤٣

لە دونیا بۆ حاڵی خراپت بگری، پێش ئەوەی لە قیامەتا بگریت،

چونکە لە قیامەت گریان هیچ سوودێکی نییە.

ئێستا تەوبە بکە،

چونکە هەتا ئێوارە تەوبە بکەیت لە قیامەتدا بەکەڵکت نایەت.

ئێستا کاتەکەت لە دەستنەچووە،

کە گەیشتیتە قیامەت، هەموو کات و هەلێکت لەدەستچووە.

(خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ).



قال رسول الله(ﷺ):

**[إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَامِكُمْ ولا إِلى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُم.]**

پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت:

بەڕاستی خوای گەورە (بۆ هەڵسەنگاندنتان) تەماشای شکڵ و شێوەتان ناکات، وە هەروەها تەماشای لەشولاریشتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات.





ئەم جیهانە ناتوانێت تێکت بشکێنێت ئەگەر خۆت ڕێگەی پێ نەدەیت. نـاتوانێت دەستت بەسەردا بگرێت ئەگەر کلیلەکان و دڵتی پێ نەبەخشیت. کەوایە ئەگەر بۆ ساتێک ئەو کلیلانەت داوەتە دەست دونیـا! خێرا وەریانبگرەوە ئەمە کۆتایی نییە، نابێت لێرەدا بمریت، دڵت بـێنەوە و بیدەرەوە دەست خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی کە «پـەروەردگـارە».



## ٤٦

ئەگەر دڵت بەندەی کەسێک بێت کە شایستە نەبێت، یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەم حاڵەتە بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە پەروەردگار، کاتێک دڵ پەرستشی پەروەردگاری چەشت و دڵسۆز بوو بۆ پەروەرێنەکەی، هیچ شتێک لە پەرستشی پەروەردگار چێژبەخشـتر نابێت لە لای، هـیچ کەسێک خۆشەویستەکەی جێناهێڵێت، مەگەر لە پێناو کەسێک بێت کە خۆشەویستر بێت لای،

دڵ دەستبەرداری خۆشەویستی سـاختە دەبێت لە پێنـاو خۆشەویستی راستەقینە و ئەبەدی، یاخود لە ترسی زیان و حەرامدا.



## ٤٧

زۆرجار لە ژیاندا توشی شتانێک دەبین و هەرگیز پەیوەندی شتەکان بەیەکەوە نابینین، کاتێک توشی ناڕەحەتیەک یاخود ئازارێک دەبین درک بەوە ناکەین ڕەنگە ئەو ناڕەحەتی یاخود ئازارە هۆکاری ڕاستەوخۆ یاخود ئەنجامی شتێکی تر بێت.

هەندێک جار شکست دەهێنین لەدەرککردن بە پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان ئازارەکانی ژیانمان و پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا، ئەو ئازار و نەهامەتییە خزمەت بە چەندین ئامانج دەکات لە ژیاندا، ساتی نارەحەتییەکان دەکرێت وەک ئاماژەیەک و چارەسەرێک بن بۆ پەیوەندییە پچڕاوەکەمان لەگەڵ بەدیهێنەرماندا...



## ٤٨

ئەم شوێنە تاریکە وێستگەی کۆتایی نییە، بیرت بێت تاریکی شەو پێش بەرەبەیان دێت، ژیانت کۆتایی نایەت تاکو دڵت لە لێدان بەردەوام دەبێت، دڵت هێشتا نەمردووە! نابێت لێرەدا بمریت.

هەندێجار بنی زەریا وێستگەیەکی گەشتەکەیە. کاتێک لە نزمترین ئاستا دەبێت دوو بژاردەت لەبەردەمدا دەبێت، دەتوانیت لە بنی زەریاکە بمێنیتەوە تاکو نوقم دەبیت، یاخود دەتوانیت مرواری کۆبکەیتەوە و دووبارە سەربکەویتەوە، بەهۆی مەلەوانیەکەوە بەهێزتر بیت بەهۆی گەوهەرەکانەوە دەوڵەمەنتر دەبیت.



## ٤٩

نەهاتوومەتە ئەم ژیانە تاکو خۆم نمایش بکەم،

جەستەم بۆ ئەوە نییە هەمووان تەماشای بکەن.

کەلوپەل، یاخود تەنها جووتێک قاچ نیم بۆ پێڵاو

فرۆشـــتن بەکاربێم. من ڕۆح و عــەقڵم هــەیە و بەندەیەکی پەروەردگارم.

بەهــاکەم پەیوەستە بە جــوانی ڕۆح و دڵ و ئەخلاقمەوە. پابەندی پێوەرەکانی جوانی ئێوە نابم، ملکەچ و پابەندی فاشیۆنەکانتان نابم، ملکەچ و پابەندیم بۆ شتێکی باڵاترە.





## ٥٠

(أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ)

تەنها یەک لەدەستدان هەیە کە هەرگیز سارێژ نابێت، تەنها یەک هۆکار هەیە کە بەبێ ئەو ناتوانین بەردەوام بین و بژین، ئەوەش کاتێکە کە پەروەردگار لەدەست دەدەین و لێی دووردەکەوینەوە... زۆربەمان پەروەردگارمان لەدەستداوە لە ژیانماندا کەچی وا بیردەکەینەوە کە هێشتا زیندووین!

وابەستەبوون بە دنیا و دروستکراو و خەڵاتەکان زۆر فریوی داوین...

ئەوانەی سەرنجیان تەنها لەسەر پەروەردگاری مەزنە و لە هەموو هەنگاوێکدا ڕووی دڵیان تێدەکەن و گۆزەی دڵیان تەنها بۆ ئەوە و هەموو ئامانج و مەبەستێکیان بەرەو ئەوە، ئەوا دونیا خۆی پێشکەشیان دەکات و دەگەن بە ڕزگاری ڕاستەقینە و هەمیشە خۆشی و ئارامی دەچێژن و هەرشتێک ڕوودەدات بۆیان بە خێر و باشەی دەزانن و وەکو ویست و قەدەرێکی ئیلاهی قبوڵی دەکەن...



# ٥١

**(وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ).**

هەر بەڵاو کارەساتێکتان بەسەر دا بێت، دەرەنجامی ئەو کار و کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان ئەنجامتان دەدا.

پەروەردگار هێندە میهرەبانە لە زۆربەی تاوان و هەڵەکانتان خۆش دەبێت و دەبوورێت.

هەر شتێکمان بەسەر دا هاتبێت خۆمان هۆکارین، بەڵام تەماشا بکە ئایەتەکە چۆن کۆتایی دێت « پەروەردگار لە زۆربەی تاوان و هەڵەکانت خۆش دەبێت و دەبوورێت»

ئەم وشەیەی لەو ئایەتە بەکار هاتووە برییتیە لە «یعفو»

کەلە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی پەروەردگارەوە وەرگیراوە.

«العفــــو»

ئەمەش تەنها بە مانای بەخشین و لێخۆشبوون نییە، بەڵکوو بە مانای سرینەوەیەتی تەواوەتیە.





## ٥٢

بۆچی دەبێت خەڵک یەکتر جێبهێڵن؟!

پرسیارەکە لەبارەی سروشتی دونیاوە بوو وەک شوێنێکی کاتی و هۆگربوونێکی کاتی.

وەک شوێنێک کە خەڵکی ئەمڕۆ لەگەڵتدان بەڵام سبەی جێت دەهێڵن یاخود دەمرن.

ئەم ڕاستییە ئازارمان دەدات چونکە دژی سروشتی ئێمەیە.

ئێمەی مرۆڤ دروست کراوین بۆ گەڕان و خۆشەویستی و هەوڵدان بۆ ئەو شتەی کامڵ و بێ کەموکوڕی و هەمیشەییە.ماڵی یەکەم و ڕاستەقینەمان بەهەشت بوو، نیشتیمانێک کە هەم کامڵ و تەواو بوو، هەم هەمیشەیی.

بۆیە هەوڵ دەدەین لەم دونیایەدا بیدۆزینەوە. بۆیە کرێمی گەنجکردنەوە بەرهەم دێنین و نەشتەرگەری جوانکاری ئەنجام دەدەین وەک هەوڵێکی بێ ئەنجاممان بۆ بەردەوامبوون و گۆڕینی ئەم جیهانە بۆ شتێک کە وانییە و هەرگیز وانابێت.





## ٥٣

ڕاتان دەسپێرم، بە شەرم کردن لە خودا، بە نهێنی و ئاشکرا؛ کەم خواردن و کەم نووستن و کەم قسە کردن. ڕۆژوو گرتن و نوێژ کردن. دوور کەوتنەوە لە تاوان و گوناە، دوور کەوتنەوە لە هەوا و هەوەسی دونیا و نەفس، دوور کەوتنەوە لە مرۆڤە نەفام و سپڵەکان. هاونشینی مرۆڤە باشەکان بن، کە باشترین مرۆڤ ئەو کەسەیە سوودی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت، باشترین گوفتار ئەوەیە کورت بێت و باس لە ستایشی خودای تاک و تەنها بکات. ( مەولانای ڕۆمی)

## ٥٤



هەر کەسێک زۆر پێبکەنێت سام و هەیبەتی کەم دەبێتەوە، هەر کەسێک زۆر گاڵتەو گەپ بکات سووک دەبێت، هەر کەسێک زۆر جۆرە کارێک بکات بەو شتە ناوبانگ دەردەکات و دەناسرێتەوە، هەر کەسێک زۆر قسە بکات زۆر تێدەکەوێت، هەر کەسێک زۆر تێبکەوێت شەرم و شکۆی کەم دەبێتەوە، هەر کەسێک شەرمی کەم بێتەوە، خۆپارێزی کەم دەبێتەوە،



هەر کەسێکیش خۆ پارێزی کەم بێتەوە

دڵی دەمرێت.







ئارامگرتن هەرئەوە نییە بەرگەی تەنگ و چەڵەمە بگری و هیچی دیکە، ئەوەیە دووربیت و ڕووناکی دووریی تونێلەکە ببینی، ئارامگرتن ئەوەیە سەیری دڕک بکەیت و گوڵ ببینی، سەیری شەو بکەیت و بەرەبەیان ببینی، پشوو کورتی ئەوەیە هەربەرپێی خۆت ببینی پێشبینی داهاتوو نەکەیت، شەیدایانی خودا هەرگیز سەرچاوەی ئارامیان لێ وون نابێت، چونکە دەزانن ئەوە کاتی دەوێت تا مانگی یەک شەوە دەبێتە هەیڤی چواردە، خودا بۆیە ناخۆشی داهێناوە تا بەختەوەری لەڕێگەی دژەکەیەوە نیشان بدات.



هەرکەسێک زانستی زیاد بوو، ئینکاریشی کەم دەبێتەوە، ئەوەیشی زانستی کەم بوو، ئینکاری زۆر دەکات.

ئەوەی زانستی زۆر بوو، دەزانێت کە چەندین بابەت هەن، قسە هەڵدەگرن بەڵام مرۆڤی بێ زانست، وا دەزانێت لەهەر بابەتێکدا یەک بۆچوون هەیە و ئەوەیشی لەو بۆچوونە ترازا، کافرە و زندیقە.

# TANYA HAJI | تەنیاحاجی



چەناڵی تەنیاحاجی لە تیلیگرام
گەورەترین چەناڵی کتێب و
پەروەردەی و تەندرووستی و
سیمینار و ڕۆشنبیری و
گەشەپێدان



tanyahaji7







## ٥٧

ئەگەر تووشی دۆخێک، یاخود بڕیارێکی سەخت هاتیت، ئاگاداربە هەوڵ نەدەیت تەنها بە چاوی سەر شتەکە ببینیت. جووڵانەوە بەپێی ئەوەی لە جیهانی دەرەوەدا دەیبینیت گەورەترین فریودەرە و دەبێتە هۆی لەناوچوون و لاڕێیی.

چاوی سەرت دابخە و، داوا لە پەروەرێن بکە دڵت بجووڵێنێت و هۆشیاری بکاتەوە. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت حەقیقەت و ڕاستییەکان ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو ئەو خەیاڵاتانەوە ببینیت بەهۆی ئازار، خۆشی، یاخود ترسەوە بۆت دروست بوون.

تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو دروستکراوەکان و دۆخە خولقێندراوەکانەوە ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ پەروەرێن بەدی دەکەیت لە هەموو شتێکدا. بزانە و هۆشیاربە تەنها چاوی خاوێن و پاک دەتوانێت هەموو شتێک ببینێت.





(يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ)

ئەی قەوم و هۆزی من، بێگومان و زۆر بە دڵنیاییەوە، ژیانی ئەم دونیایە تەنها بریتییە لە ڕابواردنێکی کەم، بەڕاستی دوارۆژ و ئاخیرەت، هەر ئەو مایەی ئومێد و ئارامگرتن و حەسانەوەیە بۆ ئیمانداران.



ژیان کامڵ و بێخەوش نییە.

هەندێک جار دەکەوین و شکست دێنین و دەدۆڕێین. چۆن بتوانین ڕێچکەی ڕزگاربوون لە نائومێدی بدۆزینەوە و جارێکی دی ژیانێکی بەختەوەرانە و تەندروستانە بژین؟

هەموو شتێک لەم ژینەدا تاقیکردنەوەیە. کاتێک ئەو دووربینانە دەگۆڕین، کە ژیانی خۆمانی لێوە دەبینین، کاردانەوەی ناوەکی و دەرەکیمان بە چەشنێکی سەیر دەگۆڕێت.

بەختەوەری وەدەست دێت، بێ گوێدان بەو دۆخانەی لە ژیاندا پێیدا تێپەڕیوین. هەردەم دەتوانین بگەڕێینەوە لای خودای میهرەبان، بێ



گوێدان بەوەی چەندە لە ڕێی ڕاستی لامان داوە. دەتوانین جارێکی دی هەڵسینەوە و لە ڕووی هێز و ئیمانەوە گەشە بکەین.



کاتێک ئازیزی مەدینە (ﷺ) خەمباربوو،

ئەم فەرمایشتە جوانەی فەرموو:

«چاوەکان فرمێسک دەڕێژن، دڵ هەست بەخەم دەکات، بەڵام زار هیچ شتێک دەرنابڕێت جگە لەوەی خودا پێی ڕازییە».

ئەمە ئارامگرییە.





## ٦١

زۆر گرنگە یەکەم شت تێگەیشتنێکی دروستمان لەبارەی خودای میهرەبانەوە هەبێت و گومانی باشی پێ ببەین، تێگەیشتنێکی ئەرێنیمان هەبێت لە بارەیەوە و، ئەو تێگەیشتن و پەیوەستیەش پێویستە لە ناخەوە بێت نەک تەنها لەسەر ڕووکار و پۆشاکمان ڕەنگ بداتەوە.

قورئان، دەکرێت بە ڕێکی و جوان بخوێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر کاریگەری لەسەر دڵەکان جێنەهێڵێت ئەوە ئامانج و مەبەستی ڕاستەقینەی خۆی نەپێکاوە.

کاتێک مانگی ڕەمەزان دێت و قورئانێکی زۆر دەخوێنینەوە، ڕەنگە چەند جارێک خەتمی بکەین بەڵام نەمانگۆڕێت ئایە لەوە تێدەگەین کە دەیخوێنینەوە؟

ئایا دەچێتە دڵەکانمانەوە یاخود تەنها بەڕووکەشە؟

- زۆر گرنگە بچێتە قووڵایی ناخەوە.



## ٦٢

ئایا دەزانیت کێ دەیەوێت سەرنجت بخەیتە سەر خاڵی لاوازی خۆت؟

- شەیتان.

یەکێک لەو هۆکارانەی شەیتان دەیگرێتە بەر بریتییە لەوەی سەرنج و هۆشت بخەیتە سەر هەڵە و کەموکوڕییەکانت،

دەتخاتە نێو نائومێدییەوە.



٦٣

قال رسول الله (ﷺ):

**[ارْحَموا تُرْحَموا، و اغفِروا يغْفِرِ اللهُ لكم]**

خۆشەویستمان، صەڵات و سەلامی خودای لەسەربێت فەرموویەتی:

سۆز و ڕەحمکە بە خەڵک، هەم خەڵکیش ڕەحم بە تۆ دەکەنەوە و، هەم خوداش ڕەحمت پێدەکات...

لە خەڵک ببوورە و چاوپۆشییان لێبکە،

هەم خەڵکیش لە تۆ دەبوورنەوە و چاوپۆشییت لێدەکەن،

هەم خوداش لە دونیا و دوارۆژدا چاوپۆشییت لێدەکات و لە کەموکوڕی و گوناهەکانت دەبووڕێت.



٦٤

(وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا)

{فەرمان کردن بە چاکە کردن لەگەڵ دایکو باوک}

وە پەروەردگارت فەرمانی کردووەو بڕیاری داوە کە هیچ کەسێک نەپەرستن تەنها زاتی پیرۆزی الله نەبێ چونکە تەنها ئەو شایەنی پەرستنە،

وە فەرمانی کردووەو بڕیاری داوە کە لەگەڵ دایک و باوکتاندا چاکەکار بن، بەتایبەتی کاتێک یەکێک لەوان یان هەردووکیان لە تەمەنی پیریدا لای تۆ دەبن،

ئەوا کەمترین وشەیان پێ مەڵێ کە پێیان ناخۆش بێت تەنانەت پێیان مەڵێ ئۆف،

(ئۆف کەمترین وشەیە بۆیە خوای گەورە بەکاری هێناوە، ئەگەر لەو وشەیە کەمتر هەبوایە ئەوەیشی بەرامبەر دایک و باوک قەدەغە دەکرد)،

وە بە ڕەقی و بە توندی و ناشیرینی مامەڵەیان لەگەڵدا مەکە

(دەست رامەوەشێنە بەسەریاندا)، بەڵکو بە وشەیەکی نەرمونیان و سۆزو بەزەیی و ئەدەب و ڕێزەوە قسەیان لەگەڵدا بکە.

 ٦٥ 

(رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا)

پەروەردگارتان زاناترە چی لە نەفسی ئێوەدایە،

ئەگەر ئێوە خۆتان چاکەکارو پیاوچاک بن، ئەوە هەر کەسێک بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوەو تەوبە بکات خوای گەورە زۆر لێخۆشبووەو لێیان خۆش ئەبێت.

 ٦٦ 

(كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ)

هەرچی لەسەر ڕووی زەوی هەیە لە خەڵکی و ئاژەڵ و گیانلەبەران هەر هەموویان ڕۆژێک لە ڕۆژان لەناو ئەچن و کۆتاییان پێ دێت.

(وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ)

تەنها زاتی پیرۆزی پەروەردگاری تۆ دەمێنێت کە خوایەکە خاوەنی گەورەیی و پیرۆزی و ڕێزەو شایانی ئەوەیە کە بەگەورەو بەڕێز بزانرێت و گوێڕایەڵی بکرێت و اسەرپێچی نەکرێت.

## ٦٧

گەنجێک بەلای پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) تێپەڕی و بە خێرایی دەچووە سەر کارەکەی، هاوەڵان بینیان چەندە بەتوانا و چالاکە، وتیان ئەگەر ئەوە لە پێناوی خوادا بووایە ئەی پێغەمبەری خودا؟

پێغەمبەر ئازیزمان (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر لەماڵ دەرچووە هەوڵ دەدات بۆ منداڵە بچوکەکانی ئەوە لەپێناو خوادایە، ئەگەر دەرچووە هەوڵ دەدات لە پێناو دایک و باوکێکی پیری بە ساڵاچوودا ئەوە لە پێناو خوادایە، ئەگەر لە پێناو نەفسی خۆیدا دەرچووە بۆ ئەوەی بیپارێزێت و نەدار نەبێت ئەوە لە پێناو خوادایە، ئەگەر بۆ خۆدەرخستن و خۆهەڵکێشانیش دەرچوو بێت ئەوە لە پێناو شەیتاندایە).



## ٦٨

سەرنجی یەکتر ڕادەکێشین،

بە یەکتر هۆگر دەبین،

خۆشەویستی دێتە نێوانمان،

ئالوودەی یەکتر دەبین،

ڕاستەقینەی یەکتر دەناسین،

جیاوازی سەرهەڵدەدات،

ناکۆکی پەیدا دەبێت،

ئاژاوە ژیانمان لێ تاڵ دەکات،

یەکتر بێهیوا دەکەین،

تۆمەت دەخەینە پاڵ یەکتر،

دابڕان دەکەوێتە نێوانمان و هەوڵی سڕینەوەی یەکتر دەدەین.

ئەمە ئەو مێژووە بێمانایەیە بەشێک لە خەڵکی پیایدا گوزەر دەکەن.

# ٦٩

بە نووری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بووبوون

غەریبی تازە هاتوو وایدەزانی پێغەمبەرستانە

مەحوی لە قەصیدەی بەحری نوور، باسی بەسەرهاتی حەزرەتی سەلمانی فارسی دەکات، کاتێک دەچێتە مەدینە و پرسیاری پێغەمبەری خوا دەکات (ﷺ).

کاتێک حەزرەتی سەلمان (غەریبی تازە هاتوو) دەچێتە مەدینە و پرسیار دەکات. خەڵکیش وەصفی پیغەمبەری بۆ دەکەن تا کە بینی بیناسێتەوە، هاوەڵان بە نووری پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە کاریگەر ببوون، حەزرەتی سەلمان هەموویان لێ بووبووە پێغەمبەر، سەیری هەر کامێکیانی دەکرد، بە ئاکار و جلوبەرگ و گوفتار و ڕەفتاریان لە پێغەمبەر دەچوون.

باشترین وەفا و ئەمەک بەرامبەر نازداری خۆشەویستمان (ﷺ)، بەرز ڕاگرتنی سوونەتە پیرۆزەکانی و جێبەجێکردن و ڕەنگرێژکردنی ژیانمانە بە فەرمایشتە شیرینەکانی.



## ٧٠

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموویێت:

کاتێک بەهەشتیەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە،

خوای گەورە لێیان دەپرسێت:

حەزتان لەچیتر هەیە، تا بتاندەمێ؟

ئەڵێن: پەروەردگارا!

مەگەر ڕوومەتت گەش و سپی نەکردووین و، ڕووسوورت نەکردووین؟!

مەگەر نەتخستوینەتە بەهەشتەوە و، لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت نەکردووین؟

ئیتر چی هەیە لەوانە زیاتر بێت؟!

ئینجا پەردە لەنێوان دا هەڵدەگیرێت و، بەچاوی خۆیان خوای گەورە دەبینن،

ئیتر لە سەیرکردنی پەروەردگار تێرنابن و، شتێکیان نەدراوەتێ کە لایان خۆشتر بێت لەوەی کە خوای گەورە دەبینن.



## ٧١

هاوەڵی بەڕێز،

(عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) دەڵێت:

پرسـیام لە پێغـەمبەرمـان کرد (ﷺ) سـەبارەت بە خۆشەویستترین کردار لەلای خودا.

فەرمووی:

[الصلاة عَلَى وَقْتِهَا،قالَ:ثمَّ أَيُّ؟قالَ:بِرُّ الوَالِدين.قالَ:ثُمَّ أَيُّ؟ قالَ:الجِهادُ في سَبيلِ الله.قالَ:حَدَّثَني بِهِنَّ وَلَوِ استَزَدتُهُ لَزادَني]

واتە: گەورەترین کردار لەلای خودا نوێژە لەکاتی خۆیدا،

لەپاشدا گوتم: چی تر؟



فەرمووی: چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک، دیسان هەر گوتم چی تر؟

فەرمووی: جیهاد لەڕێگای خودادا.

(عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) دەڵێت:

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم قسانەی بۆ کردم و ئەگەر پرسیاری زیاترم لێ بکردبایە وەڵامی زیاتری دەدامەوە.





## ٧٢

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

ئەگەر خــراپەیەکت کرد چــاکەیەک لە دوای بکە خــراپەکە دەسرێتەوە،

هاوەڵی ڕێزدار،

(ئەبو زەڕی غەفاری) فەرمووی:

گوتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

ئایا **(لا إله إلا الله)** لە چاکەکانە؟

فەرمووی: باشترینی چاکەکانە.



 ٧٣ 

**(وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)**

ئێوە نوێژەکانتان بکەن و ئەنجامی بدەن و ڕای بگرن، وە زەکاتی ماڵتان بدەن، وە لە دونیادا هەر کردەوەیەکی چاک پێشبخەن و بینێرن بۆ قیامەتی خۆتان ئەوە لە ڕۆژی قیامەت لای خوای گەورە ئەجرو پاداشتەکەی دەبیننەوە، بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر بینایە بەهەموو کردەوەیەک کە ئێوە دەیکەن و هەمووی دەبینێت.



## ٧٤

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ﴾

{باوەڕداری ڕاستەقینە لە مەلائیکەت باشترە}

بەڵام ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە (کردەوەی چاک ئەوەیە نیەتت بۆ خوای گەورە بێت و بۆ ریات نەبێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت و بیدعە نەبێت)،

ئەمانە باشترین دروستکراوی خوای گەورەن، ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لە زانایاندا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە باوەڕداران ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو ئەهلی تەوحیدو یەکخواپەرستن و شەریکیان بۆ خوا دانەناوەو کردەوەی چاکیان کردووە ئەمانە فەزڵیان زیاترە بەسەر مەلائیکەت، لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەفەرمووێت:

ئەم باوەڕدارانە باشترین دروستکراوی خوان، واتە: لە جنیش باشترن، تەنانەت دەفەرموون: لە مەلائیکەتیش باشترن، هەر کەسێک عیبادەتی خوا بکات و شەریک بۆ خوا دانەنێت و کردەوەی چاک ئەنجام بدات ئەمانە لای خوای گەورە لە مەلائیکەت بەڕێزترن.




## ٧٥

**﴿رَّسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَـٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا﴾**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایەتەکانی خوای گەورەتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، کە ڕوون و ئاشکران، تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەهۆی ئەو زیکرو قورئانەوە ئەو خەڵکەی کە ئیمانیان هێناوەو شوێنی دەکەون وە کردەوەی چاک دەکەن دەربکات لە تاریکییەکانی کوفرو شیرک و تاوان و نەزانی بۆ ڕووناکی و نووری ئیسلام و ئیمان و کردەوەی چاک و زانست و زانیاری، وە هەر کەسێک ئیمان بە خوای گەورە بێنێت وە کردەوەی چاک بکات،

(کردەوەی چاک ئەوەیە بۆ خوا بێت و بۆ ریا نەبێت، وە لەسەر سوننەت بێت)، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە ناو باخ و باخاتێکەوە لەناو بەهەشتدا کە جۆگەلەی ئاو بە ژێر دار وماڵەکاندا دەڕوات وە بە نەمری و بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە،

وە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی فراوانیان پێ دەدات لە هەر شتێک کە ویستیان لێبێت و داوای بکەن.



## ٧٦

(وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)

لێیان خۆشببن و چاوپۆشییان لێ بکەن،

مەگەر ئێوە حەزناکەن خوداش لێتان خۆش ببێت،

خودا هەمیشە گوناهبەخش و میهرەبانە.



## ٧٧

خراپە و تاوان ئەو کاتە عەیبە و خراپەی پێ دەگوترێت کە بە چاوی خۆمان ببینین،

نەک تەنها ئەوەی ببیستین و بەس.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمان پێمان دەڵێت:

تەنانەت با ئەو چاوەشتان نەبێت کە خراپەی پێ دەبینن.

با هەموو دیتنێکتان بەچاوی میهرەبانی و پاکی و بەرائەتەوەبێت.

جا ئەگەر هاتوو خراپەیەکیشتان بیست، ئێوەش داپۆشن و لەگەڵ خۆتان ببەنە ناو گۆڕ تاوەکو لەوێدا ببێت بە نوورێک و تاریکی خراپە و تاوانەکانتان بۆ نەهێڵێت.



## ٧٨

وەرە!

حەزت لە بەهەشتە؟

ئەوە دەزانی چۆنە؟

زۆر ئاسانە!

بەس ئەمەت لەیاد بێت و لەبیری نەکەیت:

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ)،

دەفەرمووێت:

**[حب لأخيك ما تحب لنفسك]**

ئەوەی بۆخۆت پێتخۆشە،

بۆ برا ئیماندارەکانیشت پێتخۆش بێت.

إن شاءاللّٰه دەچیتە بەهەشت.



## ٧٩

خـــودا،

مرۆڤی لە قوڕ درووستکرد،

لە نزمایی،

لە ڕێگای پەیامە ئاسمانییەکان مەخلوقە شکۆمەندەکەی خۆی،

لە زەوی و قوڕەوە بەرەو ئاسمان و بڵندایی بەرزکردەوە.

بەڵام ڕۆژئاوا و چەپ،

زیاتر لەو قوڕەدا ڕۆیان چواند و هەرچی کێشە و خەم و هەممە خستیانە دڵ و ژیان و گیانیەوە.

## ٨٠

دڵ و دەروون بە زانست دەژیێنەوە و بە نەزانی دەمرن، جیاوازی زانا و نەزان وەک جیاوازی نێوان زیندوو و مردووە، زانست نوورە و نەزانی تاریکی، زانست نوورە، چونکە مرۆڤ بە زانستی خودا دەناسێنێت و لێی نزیک دەبێتەوە، زانست نوورە، چونکە ڕێگەی دروست و ڕەوا بۆ مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە، بەبێ بوونی زانست ڕاوەستان لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام ئەستەمە.

## ٨١

زانست بە خودا، زانستە بەناو و سیفەتەکانی خودا، یەکێک لەو ڕێگایانەی لەبەردەم مرۆڤە بۆ زانست بەخودا، ڕێگەی تێڕامان و بیرکردنەوە لە ئاسۆی دەروون و گەردوون، تێڕامان لە زەوی و هەموو ئەو گیاندار و ڕووەک و بوونەوەرانەی بەسەر ئەم هەسارەیەدا پەرش و بڵاون، بیرکرنەوە لەو نیعمەتانەی ژیانی مرۆڤیان پێوە گرێدراوە،

لە خۆر و مانگ و ئاو و هەوا و خۆراک،

ئەم ڕێگەیە لە قورئاندا بە ڕێگە (بصر) ناوبراوە:

**(أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ).**





٨٢

له موناجاتەکانی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ):

خـــودایە من داوای خۆشـــەویستیێ تۆ دەکەم، هەروەهـــا خۆشەویستی ئەو کەسەی تۆی خۆشدەوێت و خۆشەویستی ئەو کارەی لە خۆشەویستی تۆ نزیکم دەکاتەوە.

(صحيح الترمذي للألباني)



٨٣

بنـاغـــەی عـیبادەت

بریتییە لە خۆشەویستی خودا،

بەڵکوو بریتییە لە تەنها کردنەوەی خودا بە خۆشەویست و هەموو خۆشەویستی بۆ خودا بێت و لەگەڵ ئەو کەسێک و شتێکی تری خۆشنەوێت، بەڵکوو لەپێناو ئەو هەموو کەسێک و شتێکی خۆشبووێت.





## ٨٤

مەحەببەت،

خۆشەویستییە بۆ

خودا و بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ)،

خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستی خودایە، چونکە وەسیلەیە بۆ لای خودا و ناسین و گەیشتنە بە خودا،

بە شوێنکەوتنی ئازیزمان (ﷺ) دەگەین بە خۆشەویستی خودا، مرۆڤ ئەگەر هەڵبژاردنی هەبێت، ناتوانێت شوێنی کەسێک بکەوێت و خۆشینەوێت!



## ٨٥

تەنها زاتێک شایستە بێت بە دڵپێدان خودایە،

ئەو خالیق و ڕۆزیدەر و هیدایەتدەری مرۆڤە، بۆ تەنها چرکەیەک مرۆڤ بەبێ خودا ناژی،

ڕۆحی مرۆڤ لەلایەن خوداوەیە و بە هەمیشەیی تامەزرۆیە بۆ گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار، خۆشەویستی خودا لە هەویر و فیترەتی مرۆڤدایە، ڕۆحی مرۆڤ بە هاتنی بۆ سەر ئەم هەسارەیە لە خودای خۆی دابڕاوە و تامەزرۆیە بۆ گەڕانەوە.



## ٨٦

یەکێک لە خۆشەویسترین مرۆڤەکان لای خودا کێیە؟

ئەو کەسەیە زۆرترین سوودی بۆ خەڵکی هەبێت.

تۆ سوودت بۆ کێ هەیە؟







## ٨٧

قال رسول الله (ﷺ):

**[إن الله رفيق يحب الرفق الأمر كله.]** (إبن ماجة)

واتە: خۆشەویست صەڵات و سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمووێت: خودا خۆی بە بەزەیی و نەرم و نیان و میهرەبانە،

لەهەرچی کار و فەرمانیشە نەرم و نییانی و میهربانی پێخۆشە.



## ٨٨



پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرمووێت(ﷺ):

هەر کاتێک هەستایت نوێژ بکەیت، نوێژێکی ماڵئاواییانە بکە!

**[أذكرِ الموتَ في صلاتكَ].**

لە نوێژەکانتدا یادی مردن بکەوە،

وابزانە مردوویت،

وابزانە لەنێو کفنی سپیدایت،

وابزانە گەیشتیتە نێو گۆڕ!

# ٨٩

زۆربەی قسەی خەڵکی سوودی نییە،

زۆربەی هەرە زۆری.

ئەی خودای گەورە و میهرەبان، کام قسەیە زۆر بە سوودە؟

(لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا)

وشە و گوفتاری ئەو کەسە بەسوودە و کەڵکی هەیە کە بە وشە جوانەکانی خەڵکی هان دەدات بۆ خێر و سەدەقە و بەخشین.

ئا ئەوەیە قسەی خێر و چاکە،

خودا وا دەفەرمووێت.

## ٩٠

پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ)،

ڕوو دەکاتە هەمووتان،

پێتان دەڵێت :

**[بلغوا عني ولو آية]**

هەمووتان لەدوای من، وەکوو من، دیینەکەتان بگەیەنن بە خەڵکی،

ئەگەر بە ئایەتێکیش بێت.

لەگەڵ کێیەتی؟

هەمووتان...



## ٩١

هەر کەسێک بەردەوام،

لەهەموو هەڵسوکەوتەکانی ژیانیدا،

لە گوفتار و ڕەفتاریدا،

لە مامەڵەکردن لەگەڵ خێزان و خانەوادەکەیدا،

لە کڕین و فرۆشتنەکانی و لە تەواوی ژیانیدا، پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) نەکاتە پێشەنگ و سەرمەشقی خۆی، ئەو نەکاتە پێوانە بۆ ژیان و هەڵسوکەوتەکانی خۆی؛

بە زانا و تێگەیشتوو لەدین هەژمار ناکرێت!



## ٩٢

ئاگاداربە!

وا بیرنەکەیتەوە غەفڵەت گوناهـ و تاوان بێت، بەڵکو سزایەکە لە دەرەنجامی ئەو گوناهـ و تاوانانەی کردووتە، تووشت هاتووە.

مەگەر لەو سزایە خراپتر هەیە کە زیکر و

یادی خۆی لێ مەحرووم کردووی!

## ٩٣

فەخری کائینات (ﷺ) فەرمووی:

پەروەردگار سەرپشکی کردم لە نێوان شەفاعەتکردن و لە نێوانی ئەوەی کە نیوەی ئوممەتەکەم بچن بۆ بەهەشت،

بەڵام من شەفاعەتکردنم هەڵبژارد چونکە شەفاعەت پێویستتر و گشتگیرترە.

ئێوە وای دەبینین کە ئەمە بۆ بڕوادارە لەخواترسەکانە؟

نەخێر، بەڵکو بۆ ئەو کەسانەیە کە زۆر لە گوناهـ و تاوان ڕۆچوون.



(لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ)

واتە: تا لە ڕۆژی دوایی، پەروەردگار پرسیار لە ڕاستگۆیان بکات دەربارەی ڕاستگۆییەکەیان

(مەبەست لە پێغەمبەران دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیان)

چ جای لێپرسینەوە لە کارە ناڕاست و درۆکانی ئێمە!



پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموویێت:

خوای گەورە بە حەزرەتی داوودی (علیه السلام) فەرموو: ئەی داوود ئەوانەی پشتیان لە من کردووە ئەگەر بیانزانیبا چەندم پێخۆشە بگەڕێنەوە تاوەکو منیش میهرەبان و لێخۆشبوو بم لەگەڵیان. وە چەندە تامەزرۆم تاوەکو تەرکی گوناه و تاوان بکەن، بێگومان لە خۆشیدا دەمردن و ئۆقرەیان لێ دەبڕا بۆ خۆشەویستی من. ئەی داوود ئەمە ویست و خۆشەویستیمە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە پشتیان لێم هەڵکردووە، ئەی دەبێت ویست و خۆشەویستیم بۆ ئەوانەی کە ڕوویان تێکردووم چۆن بێت.!



## ٩٦

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

هەموو ئوممەتم دەچێتە بەهەشت، تەنیا ئەوەی نەیەوێت.

هاوەڵانی ڕێزدار عەرزیان کرد:

جا ئەی خۆشەویستی خودا (ﷺ) کێ هەیە نەیەوێت؟

خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمووی:

هەر کەسێک گوێڕایەڵی من بکات دەچێتە بەهەشت. ئەوەشی کە سەرپێچیم بکات دیارە کە نایەوێت.





## ٩٧

پێغەمبەری ڕەحمەت (ﷺ) دەفەرمووێت:

ژیان و وەفاتم خێر و بەرەکەتە بۆتان،

کە لە ژیاندام لەگەڵم دەدوێن و لەگەڵتان دەدوێم.

ئەوکاتەی وەفاتیش دەکەم، پەروەردگار هەموو کردەوەکانتانم نیشان دەدات. جا گەر خێر و چاکەی تێدا ببینم شوکرانەی خودای لەسەر دەکەم، گەر خراپە و گوناهیشی تێدا ببینم داوای لێخۆشبوونتان لەخودا بۆ دەکەم.

(ئیمامی بەززار ڕیوایەتی کردووە.)





خۆشەویستمان (ﷺ)

ڕێنیشاندەری ڕاستەقینەیە بۆ خۆشەویستی خودا و ڕێگاکەی ئەو و شوێنپێ هەڵگرتنی گەیشتنە بە خۆشەویستی خودا:

(قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).



خەم خواردن

دڵەکان لاواز دەکات،

زیان بە ئیرادە دەگەیەنێت،

وە هیچ شتێک لەوە خۆشەویستر نییە لای شەیتان

کە باوەڕدارێک بە غەمباری ببینێت.







## ١٠٠

هەر کەسێک خودا بناسێت،

زۆر شەرمی لێ دەکات و زۆر لێی

دەترسێت و زۆری خۆشی دەوێت!

کاتێک ناسینی خودا زیادی کرد ئەوە شەرم و ترس و خۆشەویستی زیاد دەکات!

هەتا زیاتر خودا لە دڵت گەورە بێت،

شتەکان لە چاوت بچووکتر دەبنەوە!



## ١٠١

**( كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ * كِتَابٌ مَّرْقُومٌ * يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ * إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ * عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ * تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ * يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ )**

ئاگەداربن! کارنامەی چاکان لە جێگایەکی زۆر بەرز و بڵنددایە لە بەهەشت، جا تۆ چووزانیت ئەو جێگا بەرزە چییە؟ نامەیەکی سەر بە مۆر و لۆکە و خێری تێدایە، فریشە نزیکەکانی خودا دەیکەنەوە و دەیبینن و ئامادەی دەبن، واتە نامەی کردەوەکان لای فریشتەکان هەڵگیراوە. بەڕاستی چاکان لەناو خۆشیی و بەهرەیەکی ئێجگار زۆردان لە بەهەشتدا. لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکانی بەهەشتدا دانیشتوون و تەمەشای ئەو هەمووە نازو و نیعمەت و بەهرەی بەهەشت دەکەن کە بۆیان ئامادە کراوە. لە ڕووخسارياندا ڕوو گەشیی و خۆشی بەهەشت دەبینی و دەزانیت لە شەڕابێکی پاک و ساف و سەرمۆریان پێدەنۆشێ،



واتە: دەستی هیچ کەسێکی لێ نەکەوتووە و چاکان خۆیان سەرەکەی لادەبەن.



ئا ئەمەیە عاقیبەت و پاداشتی چاکەکاران.



## ١٠٢

ژیانێکی کەم و کورت خایەنی دونیا،

ئەوەندە ناهێنێت ئێمە خۆمان تووشی سزایەکی هەتا هەتایی بکەین!

سزای خودا، لەهەموو سزایەکان گەورەترە،

ئاممان با تەوبە بکەین،

با بگەڕێینەوە،

با بەخۆماندا بچینەوە...

خراپە و تاوان هیچ سوودێکی نییە بۆمان،

نە لە دونیا، نە لە نێو گۆڕ، نە لە قیامەت.

ئەوەی سوودی هەیە، تەنها ئیمانداری و چاکەکاریە.



## ١٠٣

﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾

سست و بێهێز مەبن، زویر و خەمبار مەبن، ئێوەن کە لە خەڵکی تر بەرزترن،

ئەگەر ئیمانتان بە خودا و پێغەمبەر (ﷺ) هەبێت و ئەوا دڵنیا بن کەوا سەرکەوتن لە خوداوەیە.



## ١٠٤

**(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ)**

ئیمانداری ڕاستەقینە تەنها ئەو کەسانەن کاتێک کە یادی خوای گەورەیان لەلا ئەکرێت و ناوی خوای گەورەیان لا دێنیت دڵیان دەترسێت و دێتە لەرزین، وە کاتێک بیەوێت تاوان بکات پێی بڵێیت:

لە خوا بترسە، دڵی دەترسێت و دێتە لەرزین

**(وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا)**

وە کاتێک کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا ئەخوێندرێتەوە ئیمانیان پێی زیاد ئەکات،

(ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات)

**(وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)**

وە تەنها پشت بە خوای گەورە ئەبەستن و کارەکانیان تەنها بەخوای گەورە ئەسپێرن.

# ١٠٥

**﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ ۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾**

ئەی پەیامبەر (ﷺ) بڵێ:

ئەی پەروەردگار تەنها تۆ خاوەنی هەموو موڵکەکانی، موڵک بە هەر کەسێک دەبەخشی کە ویستت لێ بێت، وە لە هەر کەسێکی وەردەگریتەوە کە ویستت لێ بێت، وە هەر کەسێک بە عیززەت دەکەی کە وویستت لێ بێت، وە هەر کەسێک زەلیل دەکەی کە ویستت لێ بێت. خێرو چاکە تەنها بەدەستی تۆیە، وە بە دڵنیاییەوە هەر تۆ تواناو دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.



## ١٠٦

دڵنیـــابـــە

و ئیمانت هەبێت،

خودا،

چارەی هەموو کێشە و خەم و دڵتەنگییەکانتە!

## ١٠٧

بە تەواوە وجودتەوە باوەڕت بەوە هەبێت،

خودا، لەو جێگایەی ڕێگا نییە، ڕێگات بۆ دەکاتەوەو هیدایەتت دەدات.

ئەوەی پێویستە ئەوەیە بزانیت؛

ئەو، دەبینێت، ئەو دەزانێت، ئەو دەتوانێت.

## ١٠٨

خـــودايـــا...

چۆن نا ئومێد بم،

له کاتێکدا تۆ مەعبود و ئومێدی منیت؟!

## ١٠٩

خـــــودایه

ئەگەر ڕۆژێک،

لەبیرم کرد خودایەکی میهرەبانم هەیە،

تۆ لەبیرم مەکە کە بەندەیەکی لاواز و بچووکت هەیە.



١١٠

چارەنووس و کۆتایی هەموو مرۆڤێک
گەیشتنەوەیە بە خودا،
کەواتە دڵت بەکەس مەدە و
هەر لە سەرەتاوە دڵت بە خودا بسپێرە.

١١١

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ)

{گومانی خراپ بە یەکتر مەبەن}

ئەی باوەڕداران خۆتان دووربخەنەوە لە زۆرێک لە گومان، بەتایبەتی گومان بردنی خراپ بە کەسانی چاک لەبەر ئەوەی هەندێک لە گومانبردن تاوانە،

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت: (ئاگادارتان دەکەمەوە لە گومان بردنی خراپ چونکە درۆترین قسەیە)،

{جاسوسی لەسەر یەکتری مەکەن}

وە جاسوسی لەسەر یەکتری مەکەن،

(تەجەسوس) زیاتر بۆ خراپە بەکاردێت،

(تەحەسوس) زیاتر بۆ چاکە بەکار دێت،

وەکو پێغەمبەر یەعقوب (سەلامی خودای لێبێت)

بە کوڕەکانی فەرموو: بڕۆن (تەحەسوس) بکەن لە یوسف و براکەی،

وە غەیبەتی یەکتری مەکەن، باسی برایەکت بکەی بە شتێک کە تیایدا بێت و پێی ناخۆش بێت ئەوە غەیبەتە، وە ئەگەر تیایدا نەبێت ئەوە بوهتانەو گەورەترە،

خاتوو(عائیشە) تەنها بە خاتوو (صەفیە)ی وت: باڵاکورتە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (قسەیەکت کرد ئەگەر بیکەیتە ناو ئاوی دەریاوە بۆگەنی دەکات)،

ئایا یەکێک لە ئێوە پێی خۆشە گۆشتی براکەی بخوات بە مردوویەتی؟ ئەو کەسەیش کە لێرە نییە وەک ئەوە وایە مردوو بێت و ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات، ئێوە پێتان ناخۆشەو لاتان بێزێندراوە، وە ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن بەڕاستی خوای گەورە زۆر تەوبەی ئەو کەسانە قبوڵ ئەکات کە تەوبە ئەکەن،

وە زۆر بەرەحم و بە بەزەییە.

## ١١٢

(تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ)

{بەهەشت بۆ خۆبەکەمزانانە}

خوای گەورە دەفەرمووێت:

بەهەشتمان بۆ کەسانێک داناوە کە خۆیان بەگەورە نازانن لەسەر ڕووی زەویداو لووتبەرز نین وە ئاشووب ناگێڕن و ماڵی خەڵکی بە ناحەق ناخۆن، وە سەرەنجامیش هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن.

## ١١٣

گرنگ نییە ڕووبەڕووی چ کێشەیەک بوویتەوە،

پێویستە ئەوە بزانیت تۆ دروستکراوی خودایت و ئەو تۆی خۆشدەوێت.

تەوەکولت بە خودا بێت و دڵنیابە هیچ کاتێک تۆ لەبیر ناکات.




## ١١٤

تەقوا چییە و موتتەقیی کێیە؟

تەقوا، واتا خۆپاراستن لەخراپە، وازهێنان لەگوناهـ نەبەزاندنی سنوورزو قەدەغەکانی شەرع، یاسا،

هەروەها پێشێل نەکردنی ماف و ئازادییەکانی خەڵک.

موتتەقیی، واتا کەسێکی خۆپارێز لە سنوور و قەدەغەکراوەکان، کەسێکی دوور لەگوناهـ بەهۆش و بیر، بەچاوەکانی، بەگوێچکەکانی، بەزمانی، بەدڵی، بەدەست و دەسەڵاتی، بەقاچەکانی، بەهەستەکانی، خۆپارێز لەگوناه و سەرپێچیی و تاوان، بەتەواوی وجوودی.

## ١١٥

هیچ کاتێک لە مردن مەترسە،

بەڵکوو لەوە بترسە تا ئەو کاتەی زیندوویت،

دوو شت لە ناخی تۆوە بمرێت بە ناوەکانی

«ئیمان و ئینسانییەت».



## ١١٦

**(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ)**

ئەی باوەڕداران ئێوە پشت بە ئارام گرتن و نوێژ ببەستن بەرامبەر ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی کە ڕووبەڕووتان ئەبێتەوە، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگران دایە بەوەی سەریان دەخات و پشتیوانیان دەبێ و یارمەتیان دەدات.

ئیمانداران، لە ژیانیاندا کاتێک تووشی بەڵا و پێشهاتێکی ناخۆش و سەخت دەبن، تەنها پشت بە ئارامگری و نوێژەوە دەبەستن، ئارامگرتن و نوێژکردن، هێز و خۆڕاگریەکی زۆریان پێدەبەخشێت.



## ١١٧

(مرۆڤ)

ئەو بونەوەرەیە کە لە دەرەوە ناگۆڕدرێت،

دەبێ لە ناخ و دڵ و دەروونەوە

دەست بۆ چاکسازی و گۆڕانکاری خۆی ببات.

## ١١٨

قال رسول الله (ﷺ):

[إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلَاقِ.]

واتە: خۆشەویستمان صەڵات و سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمووێت:

بێ گومان من بۆ ئەوە نێردراوم تا ڕەوشتە بەرز و بەڕێز و جوانەکان تەواو بکەم.

## ١١٩

قال رسول الله (ﷺ):

**[أربعٌ إذا كُنَّ فيك فلا عليك ما فاتك من الدُّنيا حفظُ أمانةٍ وصدقُ حديثٍ وحسنُ خُلقٍ وعِفَّةٌ في طُعمةٍ]**

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموویت:

چوار شت ئەگەر تێتدا هەبوو ئیدی گوێ بە هیچ شتێک مەدە کە لەدونیادا لە دەستت بچێت، یاخود بێبەش بیت لێی:

یەکەمیان پاراستنی ئەمانەت، دووەمیان ڕاستگۆیی لە قسەدا، سێیەمیان باشیی و جوانیی لە ڕەوشت و لە ڕووالەتدا، چوارەمیان پاکی و حەلاڵی لە قووت و خۆراکدا.

## ١٢٠

قال رسول الله (ﷺ):

**[إنَّ اللهَ بعَثَني رحمةً وهدًى للعالمينَ]**

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموویت:

من نێردراوم بە ڕەحمەت و هیدایەت و ڕێنماییکار بۆ سەرجەمی بوونەوەران.

ئەم فەرمایشتە شیرینە، دوو ڕەوشت و ئەرکی خۆشەویستمان (ﷺ) پێدەناسێنێت.

یەکەمیان (ڕەحمەت):

کە بۆ هەموو مەخلووقاتە بە گشتی لە گرۆهی (مرۆڤ و فریشتە و جنۆکە و ئاژەڵ و تەنانەت دارو درەختیش) چونکە چۆن ئەرک و مافەکانی بۆ مرۆڤەکان دەستنیشان دەکرد، بەهەمان شێوەش مافەکانی ئاژەڵانیشی دیاری دەکرد لەسەر خاوەنەکانیان، هەم لە تێرکردنیان لە خۆراک و ئاو و شوێنی حەوانەوەیان، هەم لە لێنەدان و باری گران نەخستنە سەرپشتیان، ئەوە جگە لەوەی کە فەرمانی بە جەنگاوەرانیش دەکرد دارو درەختی دوژمنانیش نەبڕنەوە.

دووەمیان (ڕێنیشاندەر - ڕێنمایکار): ئازیزمان (ﷺ)، یەکپارچە هیدایەت و ڕێنماییە بۆ گرۆی (ئادەمیزاد و جنۆکە) بۆ خستنەسەر ڕێگای هیدایەتی ئیلاهی و بەختەوەربوونیان لە دونیا و دوارۆژدا.



# ١٢١

کاتێک کەسێک دەکەوێتە نائومێدییەوە، تەنانەت هێزو توانای تۆبەکردنی نامێنێت، چونکە زۆر هەست بەخراپی دەکات لەبارەی خۆیەوە و دەیەوێت واز بهێنێت.

تۆبەکردن پێویستی بەهیوا و ئومێدە،

هیوا و ئومێد بە لێخۆشبوون و ڕەحمی ئیلاهی. ئەگەر هیوا و ئومێدت نەبوو،

هیچ هاندەرو پاڵنەرێکت نابێ بۆ تۆبە کردن.

ئەمەش ئەو شتەیە شەیتان دەیەوێت و مەبەستێتی. چەشنی بیرکردنەوەیەکی بەردەوامە،

بیرکردنەوە لە هەموو هەڵەیەک کە ئەنجامتداوە، ئازاری داویت و بیرکردنەوە لە هەموو شتێکی ئازاربەخش کە لە ڕابردووتدا

ڕوویداوە. بـەردەوام دووبارە دەبێتـەوە، بۆچی؟

بـۆ ئەوەی تێکتبشکێنێت و بتخاتـە نائومێدییەوە.

١٢٢

قال رسول الله (ﷺ):

[أفضلُ الإيمانِ الصبرُ والسماحةُ]

خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموویت:

باشترین باوەڕ و باوەڕداریی کردن بریتییە لە ئارامگرتن و سینە فراوانی و لێبووردەیی بە دڵ و دەروون.

١٢٣

قال رسول الله (ﷺ):

[اتق الله حيثما كنت، وأَتْبِع السيئةَ الحسنةَ تمحها، وخالقِ الناسَ بخلقٍ حسنٍ]

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموویت:

هەموو کاتێک و لە هەرکوێیەک بوویت،

لە خودا بترسە و پارێزگاری سنوور و فەرمان و قەدەغەکانی بکە...

لە دوای هەر خراپەیەکتدا چاکەیەک بکە، دەیسڕێتەوە... لەگەڵ خەڵکیشدا بە جوانترین ڕەوشت، ڕەفتار و هەڵسوکەوت بکە.

## ١٢٤

قال رسول الله (ﷺ):

**[ألا أُخبركم بأحبِّكم إليَّ وأقربِكم مني مجلسًا يومَ القيامةِ؟ فأعادها مرتَين أو ثلاثًا. قالوا: نعم يا رسولَ اللهِ! قال: أحسنُكم خُلُقًا]**

پەیامبەری خۆشەویستمان (ﷺ)دەفەرموویت:

ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویستترین و نزیکترین کەستان لە هاوڕێیەتی و مەجالیسم لە ڕۆژی دواییدا؟ (سێ جار ئەمەی فەرموو)، هاوەڵانی ڕێزدار وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)،

فەرمووی ئەو کەسەتان کە زۆر ڕەوشت جوان و چاکە.

## ١٢٥

ئیمان و ئەخلاق،

مامەڵەی جوان و ڕەوشتی بەرز،

گرانبەهاترین سەرمایەی هەر موسوڵمانێکن.

## ١٢٦

مرۆڤ،

بە بەژن و باڵای نا، بە تەمەنیشی نا،

بە دڵ و دەروون و

ئیمان و ئەخلاق و ئەوین و ئیرادەی مەزن و گەورەیە.

## ١٢٧

شکۆمەندی مرۆڤ

لە ڕەوشتیدا خۆی دەردەخات،

ڕەوشت ناسنامەی مرۆڤە،

ڕەوشت، دەرخەری ناخی مرۆڤ و سەلمێنەری کەسایەتی ڕاستەقینەی ئەوە.



## ١٢٨

گەورەیی مرۆڤە باشەکان لەوەیدایە،

دەیانتوانی باشن نەبن و باش بوون.

بچووکی مرۆڤە خراپەکانیش لەوەیدایە،

دەیانتوانی خراپ نەب و خراپ بوون.

## ١٢٩

ئەگەر مەحەببەت و خۆشەویستی خودا

و پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)،

لەجیاتی دەوا و دەرمان بە خەڵکی بدەن،

کارێکی دروست و تەندروستتان کردووە.



## ١٣٠

بە یارمەتی

ڕەوشت و دڵسۆزی و خۆشەویستیتان،

بڕۆنە نێو دڵی خەڵکی و

بۆ هەمیشە تیایاندا بمێننەوە.

## ١٣١

خـــــودا

هەرگیز بە دەستی خاڵی جێت ناهێڵێت.

جێگای هەموو ئەو شتانەت بۆ دەگرێتەوە کە لە دەستت داون.

گەر داوای لێکردیت شتێک دابنێیت،

ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دەیەوێت شتێکی گەورەتر هەڵبگریتەوە.

## ١٣٢

دەزانین ئامانجی هەموو ئایینەکان ئەوە بووە ناوەوەی مرۆڤ بنیات بنێت، بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤە بتوانێت دەرەوەشی بنیات بنێتەوە،

لە هەموو پەرتووکە ئاسمانییەکان و بە تایبەتیش لە ناو قورئاندا خودا (جل جلالە) پێداگیریی لەسەر ناخی مرۆڤ کردووە، ئەگەر هاتوو ناخی مرۆڤەکە گۆڕا ئەوکاتە دەرەوەی مرۆڤەکەش بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەگۆڕێت، ئەگەر ناوەوەی ئەو مرۆڤە نەگۆڕا ئەوا ئەوەی دەرەوە دەیکات هەمووی نماییش وڕواڵەت و دیبلۆماسییەتە.

## ١٣٣

ئەو کەسەی دەزانێت کە هەڵەت کردووە،

بەڵام دیسانەوە بەرگریت لێدەکات،

ئەوە بزانە یان دایکتە یان عاشقتە.

## ١٣٤

«الحَـمْدُلِلَّـــهِ»

بۆ هەرشتێک کە هەیە و هەر نیعمەتێک کە لێمان ناگریتەوە، بۆ داپۆشین و لێخۆشبوونی گوناهەکانمان، بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکان، بۆ ئەوەی کە کارێک نادەیت بەسەر شانماندا کە لەتوانامانداا نەبێت.

سوپاسگوزارین کە بەڵێنت پێداوین،

بۆ هەموو دەردێک دەوا دەنێریت.

(إنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً).

## ١٣٥

[إذا لم يكن انسان في نفسه خير،

لم يكن للناس فيه خير.]

هەر کەسێک خێری بۆ نەفسی خۆی نەبوو،

(زەرەری بە دونیا و قیامەتی خۆی گەیاند)، ئەوە ئەو کەسە قەت خێری بۆ خەڵکیش نابێت.

## ١٣٦

هەر گوناهێک بەهۆی شەهوەت و ئارەزووی نەفسەوە کرابێت، ئومێدی عەفووی لێ دەکرێ. بەڵام گوناهێک بەهۆی خۆ بەزلزانین و فەخر بەسەر خەڵکدا و تەکەبورەوە بکرێ، زەحمەتە خوای گەورە لەو گوناهە خۆش ببێت. بۆ وێنە و میسال، گوناهی حەزرەتی ئادەم، بەهۆی ئارەزووی نەفسەوە بوو، خوای گەورە عەفووی کرد و لێی خۆشبوو، بەڵام گوناهی شەیتان بە هۆی خۆ بەزلزانین و تەکەبورەوە بوو، لە قاپی رەحمەت دەرکرا و تۆقی لەعنەتی لە گەردن کرا.



## ١٣٧

خودای گەورە دوو نیعمەتی داوە بە ئوممەتی پێغەمبەری فەخری عالەم(ﷺ) تا ئێستا نەیداوە بە هیچ ئوممەتێکی تر.

یەکەمیان ئەو ئایەتەیە، کە خودای موتەعال، لە سورەی بەقەڕەدا فەرموویەتی:

**(فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ)**

ئێوە یاد و زیکری من بکەنەوە، منیش یادتان دەکەمەوە، نیعمەتی دووەمیان ئەو ئایەتەیە کە لە سورەی غافردا فەرموویەتی:

**(ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ)**

ئێوە دوعا بکەن و لێم بپاڕێنەوە دوعاتان گیرا دەکەم و وەڵامتان دەدەمەوە و مەحرومتان ناکەم.



## ١٣٨

هیچ توویشوو و زەخیرەیەک بۆ دونیا و قیامەتی ئینسان لە پەرهێزکاری (تەقوا) باشترنییە، هیچ شتێک لە بێدەنگی جوانتر نییە، هیچ دوژمنێک لە جەهل و نەزانین دوژمنتر نییە، هیچ دەردێکیش لە درۆ خەرابتر نییە.

## ١٣٩

(لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ)

هەرگیز ناگەنە پلەی پاکیی و چاکیی و چاکەکاریی، تا لەوە نەبەخشن کە زۆر خۆشەویستە لاتان.

هەندێ جار خودا، داوای بەخشینی ئەوەمان لێدەکات کەشیرینەو چێژەکەی چۆتە ناخمان و ڕەگی داکوتاوە، ئەو ئازیزە، هەم پێی خۆشە ئێمە بالاّ بین بەبەخشینەکانمان، هەم نایەوێ جگە لەخۆی مەحبووبێکی بێ ئەندازە شیرین هەبێت لەناخمان

(ماڵ بێ یان منالّ، خێزان بێ یان پلەو پایەو پارە، جاهو جەلال بێ یان ناوو شۆرەت یان هەر شتێکی تر کە دواجار لەڕێژەی مەحەببەتی خوا کەمبکاتەوە لەناخ و وجوودی مرۆڤەکاندا)

ئەو تەنانەت حەزناکات لەخۆشەویستیشدا شەریکی هەبێت لەناخی کەسە نزیکەکانی خۆیدا.

## ١٤٠

بۆ تێگەیشتن لەژیان، پێویستە مردن بناسین و وەک پێویستییەکی حەتمیی بۆ مرۆڤ سەیری بکەین، ئەو هەرگیز ناخۆش و لەدڵ بێزراو نییە ئەگەر وەک حەقیقەتی خۆی لێی حاڵیی بین، مەگەر مردن پەنجەرەیەک نییە بۆ داخستنی ژیان؟ مەگەر دەرگایەک نییە بۆ چوونە خزمەتی خوداو نەمریی و دەستکەوتنی بەخششە گرانبەها مەعنەوییەکان؟ مەگەر ڕێگایەک نییە بۆ گەیشتن بەئازیزترینی ئازیزان و لەپێشەوەی هەمووانیش پێغەمبەران وصددیقین و شوهەداو صاڵحین و ئەولیاو ئەتقیاو ئەصفیا؟ مردن ئەو ڕووبارە ڕوونەیە، کەتینوێتی ڕۆحی مرۆڤ بۆ ئەبەد دەشکێنێ، مردن کتێبێکە دەبێ خۆشحاڵانە بیخوێنینەوە، نەک لێی ڕاکەین و پشتگوێی بخەین، مردن وانەیەکەو ئوستادێکی پیرو حەکیمە بۆ ئامۆژگاریی و موراجەعەو خۆخڕکردنەوەو بەفریای خۆ کەوتن، مردن، دیوە جوانەکەی ژیانە، دەرگاو ڕێگای گەیشتن بەئازیزترینەکانە.

## ١٤١

بەهەشت و دۆزەخ

وان لە دەروون و دڵ و گیانی خۆماندا،

واتە لە بەهەشتە بچووکەکەی دڵی خۆمانەوە دەتوانین بەرەو بەهەشتی فراوان و نەمر و نەبڕاوەی دواڕۆژ بڕۆین، مرۆڤی ناباش بە دۆزەخە گەرم و سوتێنەرەکەی ناخ و ویژدانی خۆی دەزانێت سەرەنجامی ئەو دۆزەخی هەلاهەلا و هەمیشەییە.

## ١٤٢

وشەی پاکژی لە زمانی عەرەبی (تزکیە) ی بۆ داندراوە، پاکژی زانستێکی بەرز و مەزنە، بەڵکو کرۆک و کاکڵەی سەرجەم زانستەکانە، ئەم زانستە بنەما و ڕێسای تایبەت بەخۆی هەیە، سەرەتاکەی لە مرۆڤ ناسییەوە دەست پێ دەکات و کۆتاییەکەشی گەیشتنە بە دەریای ئارامی و لاوازبوونی کۆی ئەو حەز و غەریزە شەڕانگیزانەی لە ناخی مرۆڤ ڕیشەیان داکوتیوە.

## ١٤٣

ئەگەر لە زەمەنی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)

(٣٦٠) بت هەبووبێت لە مەککە، ئەمڕۆ ئەو خەڵکە بە سەدان بت و سەنەمیان لە دڵ و دەروون مەوجوودە. بۆیە ئەمڕۆ لەهەموو سەردەمێک زیاتر پێویستمان بەو خۆشەویستە و پەیامەکەی هەیە (ﷺ).

## ١٤٤

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

کاتێک بەهەشتیەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە، خوای گەورە لێیان دەپرسێت:

حەزتان لەچیتر هەیە، تا بتاندەمێ؟

ئەڵێن: پەروەردگـــارا! مەگەر ڕوومـــەتت گەش و سپی نەکـــردووین و، ڕووســـوورت نەکردووین؟! مـــەگەر نەتخستوینەتە بەهەشتەوە و، لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت نەکردووین؟

ئیتر چی هەیە لەوانە زیاتر بێت؟!

ئینجا پەردە لەنێوان دا هەڵدەگیرێت و، بەچاوی خۆیان خوای گەورە دەبینن.

ئیتر لە سەیرکردنی پەروەردگار تێرنابن و، شتێکیان نەدراوەتێ کە لایان خۆشتر بێت لەوەی کە خوای گەورە دەبینن.

(رواە:موسلم و ترمذی).

## ١٤٥

منداڵێکیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ئازیزمان (ﷺ)،

کە گەورە بووبوو بەڵام هێشتا زمانی نەگرتبوو.

پێغەمبەر نازدار (ﷺ) بە منداڵەکەی فەرموو: من کێم؟ یەکسەر وتی:»رسول الله«

واتە: تۆ پێغەمبەری خوایت!

بەم جۆرە خودای گەورە زمانی بەردا.

(رواه البیهقی في الخصائص الکبری)



لە جیاتی ئەوەی بەدوای حەقیقەت دا بگەڕێیت،

ئەوەی وا حەقیقەت نییە لە مێشکت فڕێدە دەرەوە،

ئەوەی دەمێنێتەوە حەقیقەتە.



یەکێک لە نزا موبارەکەکانی

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) ئەوەیە دەفەرمووێت:

خودایە...

پەنات پێ دەگرم لە زانستێک کە بێ سوود بێ و لە نزایەک گیرا نەبێ و لە دڵێک ملکەچ نەبێ بۆ فەرمانی خودا و لە نفسێک شکورنەبێ و قەناعەتی نەبێ.

## ١٤٨

ئەو پێنج حیکمەتەی هەموو ئاینەکان تیایاندا بەشدارن:

- قسەکردنت لە پێویستیدا بێت.
- لە برسێتیدا نان بخۆ.
- هەرکات خەو داگیری کردی بخەوە.
- داوێنت پاک رابگرە جگە لە ڕێگەی خۆی.
- بە ڕێژەیەکی تایبەت تێکەڵ بە خەڵک بە.

هەریەک لەم پێنج حیکمەتە سێ ئاستی هەیە: زیادەڕەوی، میانەڕەوی، کەمڕەوی، لە هەموویاندا میانەڕەوبە و تەندروستی دنیا و دوارۆژ بەدەستبهێنە.

## ١٤٩

(لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا)

لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕو پووچ و درۆ و دەلەسەیەک نابیستن.

## ١٥٠

لەبیرتان بێت،

خۆشبەختی مرۆڤ پەیوەست نییە بە پێگە و ماددیاتەوە، بەڵکوو خۆشبەختی تەنها پەیوەستە بە ئەندێشە و بیرکردنەکانەوە.

## ١٥١

زۆر ئاگاتان لە دڵەکان بێت،

چونکە هیچ شتێک ئاسانتر لە دڵ ناشکێت.



## ١٥٢

دوو شت ئینسانییەت

لە وجوودی ئینسانەکان لەناو دەبات،

قسەکردن،لەکاتێکدا کە پێویستە بێدەنگ بێت،

بێدەنگبوون،لە کاتێکدا کە پێویستە قسە بکات.

## ١٥٣

هەموو حیکمەتی مرۆڤ

لە دوو وشەدا کورت دەبێتەوە:

صەبڕ و ئومێد.



## ۱٥٤

مەولانای ڕۆمی

دەربارەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێت:

بە پێغەمبەربوونی پێغەمبەر (ﷺ) قیامەت هەستا، ئەوان هەڵەیان دەکرد کە باسی قیامەتیان لەو دەپرسی، چونکە ئەو خۆی قیامەت بوو هەستابوو.

هەروەک دەڵێت: ئایا دەشێت هەواڵی حەشر لە کەسێک بپرسی کە ئەو خۆی بۆخۆی حەشرە؟!

## ۱٥٥

(بَلِ اللهُ مَوْلاكُمْ وَ هُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ)

بەحەقیقەت، خودایە دۆست و پشت و پەناتان، هەر ئەوە سەرخەرتان و هەر ئەویشە باشترین پشتیوان و سەرخەر.

## ١٥٦

زەمـــەن

باشترین مامۆستایە،

بەڵام ئەفسوس،

زۆربەی قوتابیەکانی دەکوژێت.

## ١٥٧

لێرە ڕق و خۆشەویستی

وەک بەفری بەر باران وان،

لەچاوترووکانێک جێگۆڕکێ لەگەڵ یەکدی دەکەن!



## ١٥٨

- ئایا خودات بینیووە؟

- بەڵێ، زۆر

- کەی؟

- ئەو کاتەی داپۆشیم و ڕۆژیدام و سەلامەتی کردم!

## ١٥٩

ئازیزی مەدینە (ﷺ) دەفەرموویت:

لە زمانتاندا گەرەنتی ڕاست وتن و درۆ نەکردنم بدەنێ،

منیش گەرەنتی بەهەشتتان پێ دەدەم.



## ١٦٠

سەرەکیترین و دڵهەژێنترین پەیامی مردنی هەر خزم و دۆست و ئازیزێکت، یانێ دونیا تەواو دەبێت، یانێ تەمەن هەتا هەتایی نییە، یانێ تۆش دەمریت، یانێ هاکا تۆش بۆ خزم و دۆست و ئازیزانت بوویتە پەند و پەیام و نیشانە و بەڵگە و ئایەت.

## ١٦١

هەمیشە

چاودێری هەڵەیەکت ببە نەبێتە دووجار،

لەبەر ئەوەی تەنها یەکجار مافی هەڵەکردنت هەیە.



## ١٦٢

هەمووان دەزانن ڕۆژێک دەمرن،

بەڵام هیچ کەسێک باوەڕی پێناکات.

ئەگەر باوەڕمان پێدەکرد ئەوا ڕەفتاریشمان گۆڕانکاری بەسەردا دەهات.

## ١٦٣

نوێژ و ڕۆژوو

گەورەن،

بەڵام خاوێنکردنەوە دڵ

لە کیبر و حەسد و تەماع خێری زیاترە.



## ١٦٤

[اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لا يَخْشَعُ]

خوایەگیان پەنا بەتۆ دەگرم لەدڵێک کە خشوعی نەبێ.

## ١٦٥

ناوی (الغفور) گوناهان دادەپۆشێت،

واتە تۆماریان دەکات و دایاندەپۆشێت،

ئەمە بۆ جۆرێک لە گوناه،

بەڵام ناوی (العفو) گوناهەکە دەسڕێتەوە و تۆماری ناکات.

مرۆڤی باوەڕدار بەهۆی شەرمی لە خودا پێیخۆش نییە هەندێ گوناه لە لاپەڕەی کردارەکانیدا تۆمار کرابێت، بەڵام گوناهە و ئەنجامیداوە، بۆیە پەروەردگاری بە ناوی (العفو) لەگەڵ ئەو جۆرە گوناهانە مامەڵە دەکات و لە دەفتەری کردارەکاندا دەیانسڕێتەوە و تۆماریان ناکات بۆ ئەوەی بەندەکەی شەرمەزار نەبێت.





## ١٦٦

(هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَى عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ)

خوا ئەو زاتەیە ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی قورئان دادەبەزێنێت بۆ سەر بەندەی خۆی،

تا لە تاریکاییەکان دەرتانبهێنێت و بتانخاتە ناو نوور و ڕووناکییەوە.

بەڕاستی ئەو خوایە بەسۆز و میهربانە بۆتان.

## ١٦٧

مرۆڤی ڕەشبین

لەهەر دەرفەتێکدا گرفتێک دەبینێت،

مرۆڤی گەشبینیش لەهەر گرفتێک دەرفەتێک دەدۆزێتەوە.

## ١٦٨

شانازی مرۆڤایەتی(ﷺ) دەفەرمووێت:

هیچ شتێک لای خودا

هێندەی نزا و پاڕانەوە ڕێزلێگیراوتر نییە.

## ١٦٩

ژیـــان

دووڕیانێکە هەموو ئەگەرەکانی بەڕوودا والآیە. زانابین، یان نەزان، بەختەوەربین، یان نیگەران و پەرێشان، چاکەکاربین، یان خراپەکار، تۆ لەسەر دووریانەکە وەستاوی، بزانە کامەیان هەڵدەبژێری، تۆ خاوەنی بڕیاری، تۆی ژیانت دەگۆڕی بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ. سەفەرێکی سەلامەت.

## ۱۷۰

مرۆڤی بەهێز،

کەسێکە نە چاوەڕێ دەکات بەختەوەری بکەن نە دەهێڵێت بەدبەختی بکەن.

## ۱۷۱

کورتەی ژیان

بریتییە لەم دوو ڕستەیە:

چێژ وەرگرتن لە ڕۆژە خۆشەکان و

صەبر گرتن لە ڕۆژە ناخۆشەکان.



## ١٧٢

﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾.

ئەی ئەوانەی زۆر گوناهتان تووشهاتووەو بێ تامتان کردووە لەسەرپێچیدا، هەرگیز لەبەزەیی و ڕەحمی خودا بێ ئومێد مەبن، دڵنیابن کە خودا لەهەموو تاوانەکان خۆشدەبێت، چونکە خودا بێ ئەندازە لێبوردەو میهرەبانە.

## ١٧٣

زۆربەی خراپەکانی لاپەڕەی کردەوەکانت

لە ڕۆژی دواییدا ئەو گوناهانەن کە زمان پێی کردوویت، زۆربەی ئەو خێرانەی لە لاپەڕەکەتدا دەیبینییەوە ئەو ئەو کارانەن کە دڵ بە دەستی هێناون.



## ١٧٤

سەروەری مرۆڤایەتی (ﷺ) دەفەرموویت:

هەر کەس پێیخۆشە سەلامەت بێت

با پابەند بێت بە بێدەنگبوونەوە.

## ١٧٥

خواناسێک

دەربارەی گوناه فەرمووی:

لەزەتەکانیان ڕۆیشتن و سزاکانیشیان مانەوە!



## ١٧٦

زێڕ بۆ دەرکەوتنی حەقیقەتی دەبێ بخرێتە بەر ئاگر، مرۆڤیش تا نەکەوێتە ناو گرفتەکانی ژیان و نەخۆشی و ناخۆشییەکان، هەم ئاست و حەقیقەتی دەرناکەوێت، هەم کەموکوڕیی و بێهێزی و لاوازییەکانی بۆ بەرجەستە نابن، هەم نازانێ چۆن بەرەو بالآیی و مرۆڤبوون هەنگاو هەڵگرێت.

## ١٧٧

قال رسول الله (ﷺ):

[المؤمن الذي يخالط الناس و يصبر على أذاهم خير من الذي لا يخالط الناس ولا يصبر علي أذاهم].

ئەو باوەڕدارەی کە تێکەڵیی خەڵکان دەکات و ئارام دەگرێت لەسەر ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشی و ئازارانەی کە لەلایەن ئەوانەوە پێیدەگات چاکترە

( لای خوداو خەڵکەوە )

لەو باوەڕدارەی کەتێکەڵیی خەڵک و کۆمەڵگا ناکات و ئارام ناگرێت لەسەر ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشی و ئازارانەی کە لەلایەن ئەوانەوە پێی دەگات.

## ١٧٨

قال رسول الله (ﷺ):

**[أكثروا ذكر هاذم اللذات].**

واتە: خۆشەویست صـــەڵات و ســەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمووێت:

زۆر بیری هەڵلووشەری خۆشی و لەززەت

و ئارەزووەکان بکەن کە (مردنە).

## ١٧٩

جارێکیان پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)

ئافرەتێکی بینی منداڵەکەی بەسنگی خۆی وەنابوو شیری پێ دەدا، خۆشەویستمان (ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو: بەڕای ئێوە ئەو دایکە منداڵەکەی داوێتە ناو ئاگر؟

وتیان: ناوەڵا نەخێر،

خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمووی: دەی ڕەحمی خودا بۆ بەندەکانی زۆر زیاترە لە ڕەحمی ئەو دایکە بۆ منداڵەکەی.

## ١٨٠

هیچ شتێک لەوانەی کە دواتر پاداشت و سزا و بەهەشت و دۆزەخیان لەسەرە، زووتر لەچارەنووسی مرۆڤ نەنووسراون،

بەڵکو مرۆڤ بە عەقڵ و وشیاریی خۆی،

بە ئیختیارو ئیرادەی خۆی، بە قەول و فیعل و هەڵوێستەکانی خۆی چارەنووسی خۆی لەقیامەتا دیاری دەکات، ئیمان بهێنێت و باشە بکات دەچێتە بەهەشت و کوفرو خراپەش بکاتە مەنهەجی حەیاتی دەچێتە دۆزەخەوە.

## ١٨١

منداڵەکانت بەو تێگەیشتنەوە فێر بکە

دین هەر تەنها نوێژ و ڕۆژوو نییە،

تەنها ڕیش و حیجاب نییە،

وتارێک نییە لە مزگەوتەکان!

فێریان بکە و تێیان بگەیێنە دین؛ ژیانە، ڕەوشتە، مامەڵەی چاک و جوانە لەگەڵ خەڵکی.

## ١٨٢

مرۆڤی موسڵمانان

ڕۆژانە لەنوێژدا سورەتی (الفاتحة) دەخوێنیتەوە:

(الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ).

خودا خاوەنی سەرتاپای جیهانەو پادشاو سەرداری ڕۆژی قیامەتە، بەڵام لەونێوەندەدا خۆی دەناسێنێ بە (الرحمن الرحیم).

ناوی (الرحمن) واتا خودا سەرتاپای ڕەحمەتە و پڕاوپڕە لە ڕەحمەت.

ناوی (الرحیم) واتا جەوهەری ڕەحمەتی تێدابۆتە خەسڵەتی هەمیشەیی، ڕەحمەتی لێ دەبارێت و ڕەحمەتبەخشی بەردەوام و نەبڕاوەیە. خودا هەمووی ڕەحمەتەو دارای تەواوی ڕەحمەتەو هەمیشە ڕەحمەتبەخشەو لە کۆی ئەو کردارانەی ئەنجامی دەدات. ڕەحمەتی تەوەرەی سەرەکی و بنچینەییە. ڕەحمەتی خودا هەموو مەخلوقاتی خۆی داپۆشیوەو بە ڕەحمەتی ئەو دەژین و بەردەوام دەبن ژیان.

## ١٨٣

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

باوەڕداری تەواو ئەو کەسەیە کە هەموو خەڵکی لەماڵ و گیانیان لێی ئەمین و پارێزراوبن، کۆچەر(موهاجیر )یش ئەو ئەو کەسەیە کە هەڵە و گوناهان جێ دەهێڵێ و کۆچیان لێ دەکات.

## ١٨٤

پێغەمبەری ڕەحمەت (ﷺ):

لەخودی خۆیدا هەموو چاکە و ئاکارە بەرزەکانی لەخۆگرتووە، ئەگەر ئەم دونیایەی شەڕەفمەند نەکردایە، ئەوا تا قیامەت مرۆڤایەتی لەنێو ستەم و دڕندەیی و تەنیاییدا دەمایەوە و لاوازەکانیش دەبوونە دیل و بەندەی بەهێزەکان، خراپەیش هەر سەرکەوتوو دەبوو بەسەر چاکەدا، هەمیشە ستەمکاران و ملهوڕ و بەدکارانیش حوکمی دنیایان دەکرد.

## ١٨٥

پرسیار کرا لە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ):

چییە ئەو شتەی کە زۆرترین خەڵکی دەباتە بەهەشتەوە؟

سەروەرمان (ﷺ) وەڵامی دایەوە و فەرمووی: خۆپارێزی لەگوناە و ترسان لە خودا و ڕەوشت جوانی.

## ١٨٦

هەر کەسێک

باسی ئیمان و ئەخلاقی بۆ کردی،

بەڵام لە ژیان و پەیوەندییەکانی عەمەلی صالح بوونی نەبوو،

ئەتو باوەڕی پێ مەکە و هیچی لێی وەرمەگرە.



## ١٨٧

ڕووناکی چاوەکانمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

خۆپارێزی بکەن لەستەم و زۆرداری و خواردن و دەست درێژی کردنە سەرماڵ و مافی خەڵکی، چونکە ستەم تاریکایی و

(مایەی تاریک بوونی دڵ و چارەنووسە) لەڕۆژی دواییدا، هەروەها خۆپارێزی بکەن لە چرووکی و ڕەزیلی و ڕژدیی، چونکە بەڕاستی نەتەوە و گەلانی بەر لەئێوەی بەهیلاکەت و تیاچوون دا، وای لێ کردن لەناو خۆیانت خوێنی یەکتر بڕێژن و حەرامەکانی نێوانیان (لەگیان و ماڵ و نامووس) حەڵاڵ بکەن.





قال رسول الله (ﷺ):

[إن المؤن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم].

ڕووناکی دڵ و نووری چاوەکانمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

بێ گومان و زۆر بەدڵنیاییەوە ئیماندار بەهۆی ڕەوشتی جوانییەوە دەگاتە پلەوپایەی ئەو کەسەی کە هەمیشە بەڕۆژووە و، بەهەمیشەش شەو بێدارە و

(شەو نوێژ دەکات).



سوپاسگوزاریی و شوکرانەبژێریی درووست و تەواو،

بە تەنیا بە دڵ و زمان نییە،

بەڵکوو هی کرداریشە.



## ١٩٠

ئەوانەی دەیانهەوێ مەزن بن،

دڵگەورە و دەروونباڵا بن.

نموونەیەکی چاک و جوان بن بۆ مرۆڤەکان،

پێویستە خەم و بێتاقەتی تێبپەڕێنن و

لەهەر پێشهاتێکی ناخۆش تەواو پەیامدارانە و ئیماندارانە مامەڵە بکەن.

## ١٩١

لەهەر کاتێک و لەهەر شوێنێک،

بۆ هەرکەس و هەرشتێک،

ناڕاستیی مەڵێ و ڕاستگۆ بە.

بەمە دەبیتە جێگای متمانەی زۆری خەڵکی و

خۆشەویستی دڵیان.

## ١٩٢

قال رسول الله (ﷺ):

[من يحرم الرفق يحرم الخير]

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ)دەفەرموویت:

هەرکەس بێ بەش بێت لە ناسکیی و نەرم و نیانی، بێ بەشە لە خێر و چاکی.

لە بنەڕەتدا بێ بەش بوونەکە دەستی کەسەکە خۆی تێدایە، واتە خۆی لە تەواوی ئەوشتانە دوورخستۆتەوە کە مایەی دڵنەرمیین مرۆڤەکان،

بە نموونە

قورئان خوێندنی بەردەوام، زیکری زۆری گەرم و گەشی بە دڵ و دەروون، بیرکردنەوە لە مردن و ڕۆژی دوایی و لێ پرسینەوە، ڕشتنی فرمێسکی گوناه لە ترسی خودا، نان خواردن لەگەڵ هەژاران و دەست هێنان بەسەر یەتیمان و بەهاناوە چوونیان.

## ١٩٣

دڵێک پێکهاتەی لەسەر نەرم و نیانی و،
پێکهاتەی لە مەحەببەت بێت،
لە سازگاری خۆی ناکەوێ!

## ١٩٤

ئەوەندە ئەمین بوو (ﷺ)،

ئەوەتا کاتێک ئافرەتێک منداڵەکەی بانگ دەکرد، تۆ وەرە بزانە چیت دەدەمێ!

یەکسەر لێی دەپرسێ دەتویست چی بدیتێ؟ ئافرەتەکەش لە وەڵامدا دەڵێت

ئەی پێغەمەری خودا (ﷺ)، بەنیاز بووم هەندێ خورمای بدەمێ. لە بەرامبەر ئەمەدا

خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

ئەگەر هیچ شتێکت پێنەبووایە بیدەیتێ، ئەوا درۆت لەگەڵدا دەکرد.

## ١٩٥

بۆچی یەکێک لە ناوە بەرز و موبارەکەکانی خودای گەورە (المؤمن)ە ؟

بێگومان لەبەر ئەوەیە کە ئەو زاتە سەرچاوەی دڵنیایی و ئارامی و متمانەیە. وە هەر ئەویش دڵنیایی و ئارامیمان پێ دەبەخشێت. هەمیشە دڵنیایی و ئارامی لەوەوە، تنۆک تنۆک یان لە شێوەی تاڤگەدا بەرەو ئێمە بەخوڕ دێت.

## ١٩٦

زەمەن پیر دەبێت و بەساڵادەچێت.

هەروەک چۆن فیکر و بۆچوونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون.

کەچی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) بە وێنەی ئەو خونچەیەی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵتر و پاراوتر دەبێ، هەمیشە لە نوێبونەووەدایە.

## ١٩٧

(لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي كَبَدٍ)

واتە: سوێند بەوانە، بە حەقیقەت ئێمە ئینسانمان لەجۆرەها ڕەنج و ئازاردا دروست کرد، هەر لەو کاتەوە کە گیان دەکرێ بەبەریا تا دەمرێ هەر لە ناڕەحەتی و ڕەنج دایە. کەوابوو تۆش ئارامت هەبێت لەسەر گرێ و قۆرتەکانی ژیان و لەڕێگەی دەعوە و بانگەوازەکەتدا.

## ١٩٨

هەرکات مرۆڤت

لەخەم و ئازار و دەردیسەری و

تاقیکردنەوە دابڕی،

مانای ئەوەیە لە ئیمان و مرۆڤبوونت دابڕی.

## ١٩٩

ژیان چەقی گەردوونە،

مرۆڤ چەقی ژیانە،

دڵ چەقی مرۆڤە،

ئیمان و ئەخلاقیش چەقی دڵن.

## ٢٠٠

هەنگی ئیمان،

لەسەر گوڵی دڵ نەبێت

نانیشێتەوە.



## ٢٠١

بۆ جـــوانی

پیاو سەیری ڕووخساری ئافرەت دەکات و

ئافرەتیش سەیری ڕەوشت و کەسایەتی پیاو.

## ٢٠٢

دایـــــک،

بە ڕەحمترین و

بێ بەرژەوەندیترین مەخلووقی خودایە.



## ٢٠٣

درووود و سەڵاوات ناردن

بۆ ئەو زاتە پیرۆزە (ﷺ)،

نیشانەی ئەوەیە تۆ پیسکە نیت، بێ وەفا نیت، سپڵە نیت. چونکە (البخیل) پیسەکەی تەواوە، پیسکەترین مرۆڤە لەسەر ڕووی زەویدا.

## ٢٠٤

دەزانی بۆ دوای دەخات؟

چونکە تۆی خۆشدەوێ.

حەز دەکات لەسەر خەت بیت،

ڕووت لەو بێت و زۆرترین ماوە بمێنیتەوە،

چونکە تۆی خۆشدەوێ،

حەز دەکات ڕووی تێبکەیت.

لێی بپاڕێیتەوە.

ئەو، خودایە.



## ٢٠٥

(وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ)

ئەو کەسەی راوێژ دەکات زیانمەند نابێت:

گەر تۆ سێوێکت پێ بێ و منیش سێوێکم پێ بێت،

ئاڵوگۆڕیان بکەین،

هەریەکەمان یەک سێومان لە لایە،

بەڵام گەر تۆ بیرۆکەیەکت لە لا بێ و منیش بیرۆکەیەکم لە لا بێت، ئاڵوگۆڕیان بکەین هەریەکەمان دوو بیرۆکەمان لە لایە.



٢٠٦

نیوەی ئیمان بریتییە لە (صبر)

و نیوەکەی تری بریتییە لە (شکر)[١]

ڕۆژووش نیوەی (صبر)ە:

(والصومُ نِصفُ الصَّبرِ)[٢]

کەوابوو ڕۆژوو چارەکێکە لە ئیمان،

هەر بەو جۆرەیە، ئیمان کە بریتییە لە پایەی یەکەمی ئیسلام (أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أنَّ محمدا رسولُ الله) چوار چارەکە[٣]،

ڕۆژ و چارەکێک و نوێژ و زەکات و حەج سێ چارەکەی تری ئیمانن،

ئەم چوار چارەکە دوانیان ئارامگرتن (صبر) تیاندا زاڵە، ئەوانەش بریتین لە نوێژ و ڕۆژوو، دوانیشیان شوکر تیایاندا زاڵە،

چونکە لە دەوڵەمەندی و هەبوونەوە ئەنجام دەدرێن، ئەو دوانەش بریتین لە زەکات و حەج.

---

(١) (عبدالله بن مسعود) دەڵێت: الایمان نصفان: نصف صبر ونصف شکر).

(٢) أخرجه الترمذي (٣٥١٩ )، وأحمد(٢٣١٣٩ )، والدارمي ( ٦٨٠ ).

(٣) پێشینی چاکان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئیمان بە کاری چاکە زیاد دەکات.

## ٢٠٧

پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم)

لە سوژدەکانیدا ئەم دوعای دەخوێند:

(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ، وجِلَّهُ، وأَوَّلَهُ وآخِرَهُ وعَلانِيَتَهُ وسِرَّهُ)،

خودایە لە هەموو گوناهم خۆشبە،

بچووک و گەورەی،

یەکەمین و دواهەمین،

ئاشکرا و شاراوەی.

(صحيح مسلم).



## ٢٠٨

دەبێ ئەو مرۆڤە چەند دڵخۆش بێت بە حوکمی هەتاهەتایی بەندیخانەی بۆ بڕاوەتەوە، ڕۆژێک بەڕێوەبەری بەندیخانە بانگی دەکات و پێی دەڵێ:

سەرۆکی وڵات فەرمانی لێخۆشبوونی بۆ دەرکردی، تۆ ئازادی؟! گرتنی مانگی رەمەزان لێخۆشبوون و لێبوردنی پەروەردگارە بۆ بەندەکان، ئازادبوونە لە بەندیخانەی حەزەکان و بەندیخانەی دنیا، رزگاربوونە لە بەندیخانەی هەتاهەتایی دۆزەخ، خودا لێمان قبووڵ بفەرموێ و لە ئاگر ئازادمان بکات.



## ٢٠٩

(وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ)

ئەگەر دەزانن، بەڕۆژوو بن باشترە بۆ ئێوە

چەند جۆرێک ڕۆژوومان هەیە:

ڕۆژووی ڕۆح: کورتبوونەوەی هیوا و ئاواتی دوور و درێژە لە دنیا.

ڕۆژووی دڵ: پاکبوونەوە و زیادبوونی تەقوایە.

ڕۆژووی ئەقڵ: بڕینی خەیاڵ و وەهم و بیری خراپە.

ڕۆژووی نەفس: گرتنەوەیەتی لە حەزەکان.

ڕۆژووی زمان: بێدەنگییە.

ڕۆژووی ئەندامەکانی جەستە دوورخستنەوەیانە لە گوناهـ



## ٢١٠

دەڵێن پیاوێک بەردەوام دوعای دەکرد بۆ ئەوەی خودا کۆمەکی بکات، شەوێک لە خەوندا ڕۆشنایییەکی بینی، پێی وت: داوای چی دەکەی؟ ئەویش وتی: دەمەوێ یانەسیب بیەمەوە و بۆم دەربچێت، ڕۆشنایییەکە پێی وت: باشە، پیاوەکە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوو، دەرگای لێ نەکرایەوە و بە مەرامی خۆی نەگەیشت، شەوێکی تر بە خزمەتی گەیشتەوە و پێی وت: بۆ دەستت لێ بەردام، بۆ بەڵێنەکەت نەبردە سەر، بۆچی یانەسیبەکەم بۆ دەرنەچوو؟! ئەویش پێی وت: نەزان، تۆ هێشتا بلیتت نەکڕیوە تا یانەسیبەکەت بۆ دەربچێت.



# ﴿ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾

پاداشتی باش و براوەو سەرکەوتن بۆ تەقوادارانە،

ئەوانەی خۆپاریزن لەخراپەکاریی و بەهێزن بۆ ئەنجامی چاکەکاریی.



**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel

Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf
پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link

دڵت خۆش بێت إن شاءاللّٰه
دوودڵ مەبە،
پێنج و دوو ڕۆژێکە دونیا، ئەیگوزەرێنیت...
ڕازی بە،
سوپاسی خودا بکە،
ئارامگربە،
دوعا بکە،
پاڕانەوە، تەنها ڕێگەی ئارامیی و دڵنەوایی تۆیە.

# ئازیزی من خودایە

«وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ»

بەرگ: ئیبراهیم سالح



نرخ: 5000



ناوەندی ئاسمان
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر - پشت پارێزگا- بازاڕی کتێبفرۆشان 0750 42 42 101
NAWANDI ASMAN : ناوەندی ئاسمان :

